لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# وشەی زمانی کوردی

دوکتۆر
ئەوڕەحمانی حاجی مارف

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٥

# پێشەکی

کاتێ باسی زمان دێتە گۆڕێ ، بەر لە هەموو شتێك مەبەست وشەیە . بێ زانینی وشـــە ، بە تایبەتی وشەیەکی زۆر ، زمان نازانرێ و ئاخاوتنی پێ ناکرێ . ئەمە لە کاتی فێربوونی زمانی بێگانەدا بەئاشکرا دەردەکەوێ . ئەگەر کەسێك لە دەنگەکان و ڕێزمانی زمانێکدا شارەزایی باش پەیدا کردبێ ، بەڵام وشەی کەم لەبەر بێ و موفرەدات کەم بزانێ ، ئەوە ئەو کەسە بە هیچ جۆرێك ناتوانێ باش لەو زمانـــە بگا و باش پێی بخوێنێتـــەوە و وتووێژی پێ بکا . بێگومان ، تەنیا زانینی موفرەدات و پشتگوێ خستنی تێکڕای دەنگەکان و پێکهاتنی ڕێزمانیش ، هەروەها مەودای باش زانینی زمان تەسك دەکەنەوە ، چونکە یەکگرتنی ئەو سێ ریشـــەیە ، ( وشـەکانی زمان ، دەنگەکان ، پێکهاتنی ڕێزمانی ) ، زمان سازدەکەن و پێكدەهێنن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، دەبێ ئەو ڕاستییە لە بیر نەکەین ، کە وا زانینی ژمارەیەکی زۆر لە وشـــە و زانینی بەکارهێنانیان ڕادەی زانینی زمان نیشان دەدەن . جا هەر لەبەر ئەوەشە ، وشە بە ریشەیەکی هەرە گرنگی زمان دەژمێررێت

زانینی ژمارەیەکی زۆر لە وشـە و بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی راست ، نەك تەنیا لە فێربوونی زمانی بێگانەدا گرنگە ، بەڵـکو بۆ زمانی زگماکیش ـ بۆ ئەو زمانەی لە منداڵییەوە وتوویژی پێ دەکەین ـ گەلێك پێویستە . راست نییە ، ئەگەر وا بیر بکەینەوە ، هەمتو ئەو کەسـانەی بە کوردی دەدوێن و ئەو خەڵـکەی کە زمانی کوردی زمانی زگمـاکیانە ، وەك یەك دەیزانن و ئاخاوتنیان وێکدەچێ و یەك جۆر وشـە بەکار دەهێنن ، بەڵـکو پلەی زانینی ئادەمیزاد جیـــاوازە . وەك ئاشکرایە ، ئەمەش لە گەلێك رووەوە پەیوەندی بە رادەی کولتوری مرۆڤەوە هەیە .

هۆی ئەو جیاوازییە چییە ؟

جیاوازی پلەی خوێندەواری و جۆری ژیان و توانا و هەروەها پەیوەندی جیـاواز لەگەڵ زماندا دەور دەبینێ . وەرگرتن و هەزم کردنی وشەی زمانی زگماك ، تا رادەیەك لە خۆڕا و بە شـێوەیەکی میکانیکی و بێ بیرکردنەوە روودەدات . مرۆڤ وشەی زمانەکەی هەر لە منداڵییەوە بێ بیرکردنەوە ، لە کەسانی دەور و پشتی وەردەگرێ . بەڵام لەگەڵ ئەو بیر نەکردنەوەیەشدا لە وەرگرتنی وشەی زمانەکەیدا ( کە هـــەر لە منداڵییەوە دەست پێ دەکا و لە تێـکڕای ژیانیدا بەردەوامە ) چالاکی هەزم و وەرگرتن و ئارەزوو دەورێـکی گەورە دەبینن . جا لەبـەر ئەوەیە ، ئـەو کەســـانەی شێوەی ژیانیان وێکدەچـــێ و رادەی خوێندەواریـــان وەك یەکە ، جیـاوازی لە ئاخاوتنیاندا هەیە . هەندێـکیان بە زمانێـکی وشك و رەق ، وە

له کاری لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا کەلێنێکی گەورەیە. بینینی ئەو کەلێنە هەستی جوڵاندم و رایکێشام کە خۆم بەو باسەوە خەریك و ماندوو بکەم ... دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، ئەوەی بۆم کرا کردم و ئەوەی لە توانامدا بوو بەجێم هێنا ... هیچ گومانم لەوەدا نییە، کە ئەم کارەی من تەواو نییە و کەم و کورتی تێدایە. بەڵام ئەوەی شایانی باس بێ، ئەوەیە کە ئەم کتێبە سەرەتایەکە لە بارەی کێشەی وشەی زمانی کوردییەوە و گەلێك کەرەستەی نوێی وەهای تێدایە، کە تا ئێستا لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا باسیان نەکراوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم کتێبە « وشەی زمانی کوردی »، تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە رووی لێکسیکۆلۆژی ( Lexicology )یەوە پەیوەندییان بە وشەی کوردییەوە هەیە، بە تایبەتی لە بارەی مانا و واتایانەوە؛ شوێنیان لە یاسای گشتی زماندا؛ پەیدابوونیانەوە؛ بەکار هێنانیانەوە؛ دەرفەتی جێکردنەوەیانەوە لە ئاخاوتندا؛ جۆری دەربڕین و شێوەی چەسپاندنیان لە رەوانبێژیدا ... وەك ( جۆری وشە، جۆری مانا، پەیوەندی نێوان وشە، وشەی هاوبێژ، وشەی هاوواتا، وشەی دژواتا، وشەی یەكواتا، وشەی فرەواتا، وشەی تەواو، وشەی ناتەواو، وشەی بەرەڵلا، وشەی گیراو، وشەی کوردی پەتی، وشەی ئێرانی، وشەی هند و ئەورووپایی، وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا، رەگی بێگانە لە موفرەداتی زمانی کوردیدا، زۆرەزێژ، موفرەداتی زمانی کوردی لە رووی چالاکی و سستییەوە، وشەی مردە، وشەی نوێباو،

فریزی گیراو ، جۆری فریزی گیراو ، فریزی گیراو لە ڕۆی واتاوە ... هتد ) .

هەرچەندە ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوانەش دەکەوێتە سەر سێ بەشی هەرە گرنگی لێکسیکۆلۆژی : واتاناسی (علم معاني الالفاظ Semasiology) ، ئێتیمۆلۆژی (الاتیمولوجیا Etymology) ، فریزیۆلۆژی (علم العبارات الاصطلاحیة Phraseology) . بەڵام کاری فەرهەنگنوسی (Lexicography) پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کێشەی وشەوە هەیە . جا لەبەر ئەو هۆیەیە ، کە لە دوا بەشی ئەم کتێبەدا لە فەرهەنگ و جۆری فەرهەنگ و دەوری فەرهەنگ و کاری فەرهەنگ دواوین و باسی تێکڕای فەرهەنگە کوردییەکانمان کردوە ، کە لە کاری فەرهەنگنوسی و مێژوی فەرهەنگنوسی کوردی و پاراستنی وشەی کوردی و لێکدانەوە و شیکردنەوەی هەندێ کێشەدا دەوریان بینیوە .

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ، پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشم ، کە دوو بەشی ئەم کتێبە ـ واتە واتاناسی و ئێتیمۆلۆژی ، وەك وتار لە دوو ژمارەی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » دا بڵاوکراونەتەوە[2] . وە بەشێکی بەشی فەرهەنگنوسی بە زمانی عەرەبی لە ژمارەیەکی دیکەی هەمان گۆڤاردا چاپ کراوە[3] . هەرچی پێشەکی و بەشی

(٢) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، ١٩٧٤ ، ل ٨١ ـ ١١٦ ؛ بەرگی سێیەم ، بەشی دووەم ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠٧ ـ ٢٤٠ .

(٣) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٥ ، ل ٧٠٥ ـ ٧٢٨ .

هەندێکیان بە زمانێکی شیرین و جوان و پاراو و دەوڵەمەنـد دەدوێن .

چۆن وشەکانی زمان بناسرێن ؟

ئێمە هەر لە منداڵییەوە ، لەگەڵ فێربوونی وشەکانی زماندا فێری ئەو یاسا و دەستورانەش دەبین ، کە وشەیان پێ دروست دەکرێ و دادەڕێژرێ . ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆش دەکا کە لەگەڵ وەرگرتنی لە خۆڕا و میکانیکی هەزاران وشەدا ، بتوانین بە بیر و هۆش لە زمان وردبینەوە و شتی شاراوەی ئاشکرا بکەین و فێری ئەوە ببین ، کە وەك چەکێکی پێویست بەکاری بهێنین .

زمان هەمیشە لەگەشە کردندایە و بە وشەی نوێ دەوڵەمەندتر دەبێ . ئاشکرایە ، کە بۆ ئەمە ، بە شێوەیەکی سەرەکی ، ئەو کەرەستەیە بەکار دەهێنرێ کە لەو زمانەدا هەیە . لە سەرێکەوە وشەی حازر بەدەست هەن ، وە لە سەرێکی دیکەوە کەرەستەی یاریدەر ، بە تایبەتی پێشگر و پاشگر . بەم چەشنە ، لەو وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەن ، وشەی نوێ دروست دەکرێن .

هەر کەسێك ، زمانی کوردی بزانێ ، بێ ئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ بکێشێ ، دەتوانێ چەندین وشەی نوێی وەها ناوبێنێ ، کە لەم چەرخەی ئێمەدا پەیدا بوون . لەم دەمەدا ، کە ژیانی ڕۆشنبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی .... میللەتی کورد لە برەودایە و تێکڕای جیهان لە پێشکەوتندایە . بێگومان زمان پێویستی بە وشەی نوێ دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ وشەی نوێ پەیدا دەبێ .

بەهرەی بوونی زمان ـ نیشانەی بەختەوەری مەزنی ئادەمیزادە .
خۆش‌ویستنی زمانی زگماك و باش زانینی و چـاك بەکارهێنانی ....
ئەرکی ســەرشانی مرۆڤە و مایەی بەختیارییەتی . ناسین و زانینی
وشە و شارەزایی تێدا پەیدا کردنی کارێـکی بەرز و پێویستە .

لە نیوەی یەکەمی ســەدەی نۆزدەمدا ، کاتێك زمانناسـی بە
زانستێـکی سـەربەخۆ دانرا ، زانایان گومانیان لەوەدا نەبوو ، کە
بە تایبەتی وشە دانەیەکی سەرەکی زمانە . گەلێك لە زمانناسان لەم
بارەیەوە نوسییان و کۆڵیانەوە .

وەك ئاشـکرایە ، پەردەی رەش بەسەر ســەدان وشـەی
زمانەکەمانەوەیە و گەلێك روی گرنگی وشەی زمانی کوردی هێشتا
هەر بە ئاڵۆزی و تاریکی ماوەتەوە . هوی ئەمـەش ، ئەوەیە تاکو
ئێستا بەداخەوە لێکۆڵینەوەی قوڵ و زانستییانە دەربارەی وشـەی
زمانی کوردی نەنوسراوە .

هەرچەندە بە گشتی لێکۆڵینەوە دەربارەی زمانی کوردی کەمە ،
بەڵام تـا رادەیەك باسی ( مۆرفۆلۆژی و فۆنەتیك و سینتاکس ) ـ
کە سێ بەشی گرنگن لە لێـکۆڵینەوەی زمانـدا ـ کراوە . ئەوەی
سەرنج رابکێشێ ، ئەوەیە کە تا ئێستە چ زانایانی کورد و چ زانایانی
بێگانە لە بارەی ( لێکسیکۆلۆژی )[1] زمانی کوردییەوە شتێکی
ئەوتۆیان نەنوسیوە .
بێ‌گومان پشت‌گوێ خستنی کێشەی وشـەی زمانی کوردی

(١) شی کردنەوەی ئەم زاراوەیە و ئەوانی دیکە لە کتێبەکەدا هاتووە .

فرێزیۆلۆژی و بەشێکی کەی بەشی فەرهەنگ نوسی و فەرهەنگۆک و لیستەی سەرچاوەکان ، بۆ یەکەم جار بڵاودەکرێنەوە .

پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا هێمن موکریانی و مامۆستا شوکور مستەفا ، دوو مامۆستا و برای گەورە و هاوڕێی ئێزیکم دەکەم ، کە لە شیکردنەوەی گەلێك ڕووی ئەم باسەدا ، زۆریان هاریکاری لەگەڵ کردم و یارمەتیان دام . سوپاسی برای دڵسۆزم کاك حسەین فەیزوڵڵا جاف دەکەم ، کە گەلێك سەرچاوەی نوێی و پێویستی بۆ دۆزیوەتەوە و نیشان داوم . بەگەرمی سوپاسی مامۆستا و برای گەورەم کاك محەمەدی مەلا کەریم دەکەم ، کە لە ڕاست کردنەوەی هەڵەی چاپ و دەرکردنی ئەم کتێبەدا هاریکاری کردم هەروەها . ڕێز و سوپاسم بۆ کرێکاران و لێپرسراوی چاپخانەی کۆڕ ، کە بەڕاستی دڵسۆزانە ئەم کارەیان بۆ هەڵسوڕاندم .

تاقە هیوام ئەوەیە ، بەم کارە توانیبێتم خزمەتێکی بچوك پێشکەش بە زانیاری گەلەکەمان بکەم . لە بارەی « وشەی زمانی کوردی »یەوە پێم کرابێ چەند وشەیەکی بە کەڵك بنوسم و دوو قسەی خێر بکەم ...

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی (١)

لێکسیکۆلۆژی بەشێکە لە زانستی زمان و لە بارەی باری ئێستا و رابوردوی وشەوە دەدوێ . لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی باسای وتوویژی ئەمڕۆ و دوێنێ و شێوەی پەیدابون و پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانەکەمان و پەیوەندی لەگەڵ مێژوی گەلی کوردمان بۆ دەردەخا و ڕوون دەکاتەوە .

کاکڵ و کەرەستەی لێکۆڵینەوەی لێکسیکۆلۆژی بەر لە هەمو شتێك وشەیە . وەك ئاشکرایە (مۆرفۆلۆژی) یش هەر لە وشە دەدوێ ، بەڵام لێرەدا دەیکاتە هۆ بۆ لێکۆڵینەوە لە دەستور و

(١) وشەی لێکسیکۆلۆژی lexicology کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، پێکهاتووە لە : ( lexikos ـ وشەکانی زمان ، وشەی فەرهەنگی ) و ( logos ـ زانست ) . بەم جۆرە وشەی لێکسیکۆلۆژی بە مانای ـ زانستی وشە ـ دێت .

ڕێزمان . کەچی لە لێکسیکۆلۆژیدا کاری پێویست و گرنگ زانین و ناسینی وشە و وشەکانی زمانە .

بە وینــە ئەگەر لە باری مۆرفۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژییەوە تەماشــای وشــەی « پاك » بکەین ، دەبینین ئەوەی کە بەلای مۆرفۆلۆژییەوە گرنگە ئەمەیە کە ئەم وشـــەیە — ( ئاوەڵناوە Adjective ) ، ( ئاوەڵناوی سادەیە Adjective Simple ) ، لە ( پلەی بەراورد Comparative Degree ) دا دەبێ بە « پاکتر » و لە ( پلەی باڵا Superlative Degree ) دا دەبێ بە « پاکترین » .... هتد . بەڵام بە نیسبەت لێکسیکۆلۆژییەوە ، ئەوەی پەیوەندیی بە وشـەی « پاك » ەوە هـەبێت ، ئەوەیە کە ئەم وشـــەیە لەگەڵ « پاقژ » و « پاکژ » و « خاوێن » دا هاوواتا ( Synonym ) یە و لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکاری دەهێنن و لەگەڵ وشەی « پاك » — کە بە مانای « تێکڕا ، هەمو » دێت هاوبێژ ( Homonym ) ە .... هتد .

هەروەها ئەگەر لە وشـــەی « عەشق » وردبینەوە ، دەبینین ئەوەی بۆ مۆرفۆلۆژی گرنگ بێ ئـەمەیە کە ئەم وشــەیە ( ناو Noun) ە ، ( ناوی مەعنــا Abstract Noun ) یە ...... وە بــۆ لێکسیکۆلۆژیش ئەمە گرنگە کە « عەشق » وشەیەکە لە مێژە کورد لە زمانی عەرەبییەوە وەری گرتووە ، ئەم وشەیە لەگەڵ « ئەڤین ، ئەوین ، دڵداری » دا هاوواتایە . ... وشەی « ئەڤین » یش وشەیەکی کوردی پەتییە و سـەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوورووە و چەنــد

سالێکە لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا جێگەی خۆی گرتووە و بووە بە وشەیەکی ئەدەبی و لەگەڵ «ئەوین» و «عەشق» و «دڵداری»دا هاوواتایە ....

تاکو ئەم شوێنە تا رادەیەك ئەرك و گرنگی لێکسیکۆلۆژیمان بۆ رۆن بووەوە و بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە لێکسیکۆلۆژی لە وشە و وشەکانی زمان دەکۆڵێتەوە لە بارەی :

١ــ مانا و واتایانەوە ؛

٢ــ شوێنیان لە یاسای گشتی زماندا ؛

٣ــ پەیدابوونیانەوە ؛

٤ــ بەکار هێنانیانەوە ؛

٥ــ دەرفەتی جێکردنەوەیانەوە لە ئاخاوتندا ؛

٦ــ جۆری دەربڕین و شێوەی چەسپاندنیان لە بەلاغەدا .

ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوانەش دەکەوێتە سەر سێ بەشی هەرە گرنگی لێکسیکۆلۆژی کە بریتین لە :

واتاناسی (علم معانی الالفاظ Semasiology)[٢] و زانستی

---

(٢) واتاناسی Semasiology بەشێکی سەرەکییە لە زانستی وشە و لە گشتی ئەو مەبەلابە دەکۆڵێتەوە کە پەیوەندییان بە مانای وشەوە هەیە .

وشەداتاشین (علم الاشتقاق Etymology)[٣] و (علم العبارات الاصطلاحیة Phraseology)[٤].

لەم سێ بەشە گرنگەی لێکسیکۆلۆژیدا دەتوانرێ تێکڕایی ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە وشە و وشەکانی زمانەوە هەیە شی بکرێنەوە . منیش لەم باسەدا هەوڵ دەدەم بەو پێیە لە لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی بدوێم .

## واتاناسی SEMASIOLOGY

### وشە :

وشەکانی هەر زمانێك وەنەبێ تەنیا لە کۆمەڵێك وشە پێکهاتبن ، بەڵکو بریتییە لە یاسا و دەستورێکی ورد و ئاشکرا و تەواو و رێكوپێك و دیاری کراو لە پەیوەندی و پەیوەستی راست و رەوادادا . لێکسیکۆلۆژی زانستی نییە کە لە بارەی وشەی جوێ جوێوە

(٣) ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە کە لە پەیدابوون و پێشکەوتنی وشە و ئەو دەورانەی پیایدا تێپەڕیوە دەدوێ .

(٤) لە یەکگرتنی هەندێ وشەدا مانای تایبەتی پەیدا دەبێ و بەم جۆرە وشە و دەستە واژانە دەڵێن فرازیۆلۆژی کە بەشێکە لە زانستی وشە .

بدوێ ، بەڵکو زانستێکە دەربارەی سیستێم و دەستووری تێکڕایی وشەکانی زمان

هەرچەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لە بارەی وشـەوە ، لێکۆڵینەوە زۆرە و لە گەلێك سۆچەوە لەم مەسەلەیە وردبوونەتەوە و گەلێك زانا بەم کارەوە خەریك بوون و بەرهەمی بەنرخیان پێشکەش کردوە و ئەنجامی سـەرکەوتوویان وەدەست هێناوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا تەعریفی تەواوی وشـە نەکراوە و لەم بارەیەوە رایەکی یەکگرتوی وەها نییە کە گشت لایەك و تایبەتێتیەکی ئەم باسـەی گرتبێتەوە و هەموو زمانناسان لایەنگیری بکەن .

ئەوەی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە تەعریفی وشەوە هەبێت کە لە وڵاتی ئێمە نووسـراون ئەوەیە کە تا رادەیەك کاڵ و کرچن و تەنیا سوچێکی باسەکە دەگرنەوە(٥) .

---

(٥) بە وێنە :

مامۆستا سـەعید صدقی لە لاپەڕە (٦)ی کتێبی « صرف و نحوی کوردی »دا ( بەغدا ١٩٢٨ ) لە تەعریفی وشەدا دەڵێ : « تەنیا لفظێکە کە مەعنای ببێ ، وەکو ( پیـاو ، درەخت ، ئەسـتێرە ، بەرد ... ) » .

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە ( ٩ )ی بەرگی دووەمی کتێبی « قواعدی زمانی کوردی »دا کە ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا بلاوی کردۆتەوە ، لە تەعریفی وشەدا نووسیویێ : « ئـەو وشەیەیە کە لە=

ێشك تەعریف و دیاری کردنی راست و زانستی‌یانەی وشە ئەوەیە کە تیشك و رۆشنایی ئەو نیشانە سەرەکیانەی لە وشەدا هەن دەخۆیدا بنوێنێ . وشەش پێویستە ئەو خاسیەتە بنەرەتیانەی خوارەوەی تیدابێ :

---

= دەنگێ یا چەند دەنگێ بیك ئەهێنرێ و ئەوترێ و ئەنوسرێ ، وەك ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) ئەگەر بدرێنە دەم یەکتر ، وشەی ( خانزاد )ی لێ بیك دێ . وە وشەش دوو جۆرە : » . وە لە لاپەڕە ( ٢٢ )ی کتیبێ « ڕێزمانی کوردی » شدا ( سلیمانی ١٩٦٠ ) لە بارەی وشەوە دەڵێ : « وشە کۆرەی زمانە و لە دەنگێ وە یا چەند دەنگێ دروست ئەکرێ ، وەك وشەی ( خانزاد ) لە دەنگی ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) بێکهاتووە ، وشەش بە بۆی زۆر و کەمی واژەکانی دوو بابەتە » .

لە لاپەڕە ( ٣١ )ی بەرگی یەکەمی « فەرهەنگی خاڵ »دا ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە تەعریفی وشەدا نوسیوێتی : « وتە (کلمة ) وشەیەکە کە مەبەستێکی ببێ ، وەك ( دار ، کار ، ژن ، من ، بڕین ، دڕین ) » .

لە کتیبێ « زمان و ئەدەبی کوردی » کە د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ و د. ئیحسان فوئاد و مامۆستا صادق بەهائەدین بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی دایان ناوە ( چاپی دووەم ، بەغدا ١٩٧٢ ) ، لە لاپەڕە ( ٢٥ )دا لە بارەی وشەوە نوسیویانە : « وشە ئەو بێژەیەیە کە رستەی لێ بیك دەهێنرێت » ، لە لاپەڕە (٢٨)یشدا دەڵێن : « وشە یا واژە لە چەند دەنگێك بیك دێ » .

١– پێکهاتنی فۆنێتیکی هەبێت ؛

٢– مانا و واتادار بێ .

٣– قەوارەی ڕێزمانی هەبێ .

٤– هەمیشە خاوەنی دەنگ و مانا بێت ؛

٥– هەردەم لە ئاخاوتندا وەك دانەیەك (وحدة) لە زمان بەکار بهێنرێ ؛

٦– پتر لە یەك گیرەی نەبێت ؛

٧– بتوانرێ لە ڕستەدا بەکار بهێنرێ ؛

٨– توانای هەبێ ببێت بە ئیدیۆم .

## جۆری وشـــە :

بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی ـ وەکو هەمو زمانەکانی سەر ئەم زەمینە ـ ئەو وشانەن کە مانای دیاردەیەکی (ظاهرە) مەوزوعی واقیعی جۆراوجۆر دەبەخشن و بەم وشانەش دەڵێن وشـەی تەواو Autosemantic words . لە ڕوی مۆرفۆلۆژییەوە ئەم وشـــانە بە زۆری (ناو و ئاوەڵناو و ژمارە و کردار و جێناو ...... ن) .

هەروەها پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە هەندێ پۆل وشە، وەك (پیتی بانگهێشتن و وشەی یاریدەدەر .......) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە دیاردەی واقعییەوە نییە و مانایان شێوەی تایبـەتی

خۆی هەیە و هەر لەبەر ئەوەشە کە مۆرفۆلۆژی بە لێکۆڵینەوەی ئەم وشانە گرنگی دەدا و لێکسیکۆلۆژی تا رادەیەك دەیانخاتە پشت گوێ . لە زانستی وشەدا بەم چەشنە وشانە دەڵێن وشەی ناتەواو .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر وشەی تەواو هەن :

١– ئەو وشانەی لە شێوەی دروست بوون و دارشـــتنیاندا تا رادەیەك ماناایان روون و ئاشـکرایە (Motivated, having symbolic value) . ئەم وشانەش لە ئەنجامی وێکچوون و نزیکی ( رەنگ ، شێوە ، ئەرك ، ئەندازە ، خاسیەت .... ی ) دوو شتدا داتاشراون ، وەك :

شەکرشکێن — لە شـێوەی دارشتنی ئەم وشەیەدا ئاشـکرا دیارە کە ئامرازێکە شەکری پێ دەشـکێنرێ .

ســەوزە — هەمو جۆرە شینایییەك دەگرێتەوە کە روابێ . لە وشـەی ( ســەوز )ەوە هاتووە کە جۆرە رەنگێکە ـ واتـە لــە وێچوونی ( رەنگ )ەوە پەیدابووە .

٢– ئەو وشانەی کە پێکهاتن و شێوەی دروست بوونیان مانایان روون ناکەنەوە ( Devoid of symbolic value ) ـ واتــە شێوەی دارشتنیان مانای ئاشکرا و دیار نیشان نادەن ، وەك :

دالٚ — هـــەرچەندە ئاشـــکرایە کە (دالٚ) مەلێکی گەورەی گۆشت خۆرە ، بـەڵام شـــێوەی داڕشتنی مانای ڕوَن ناکاتەوە .

ترێ — ئاشکرایە کە بەری درەختی مێوە ، بەلام ئەم مانایە لە شێوەی داڕشتنی وشەکەدا دیار نییە .

بێشك هەر یەك لەم جۆرە وشانە مانای تەواوی خۆیان هەیە و بێ واتا نین . هەر وشەیەکیش یەك یاخود چەند مانایەکی هـــەیە ، ئەو وشانەی تەنیا یەك مانایان هەیەن لە لێکسیکۆلۆژیدا پێیان دەڵێن وشـــەی یەك واتا Monsemous word ، ئەو وشانەش کە مانایان زۆرە فرەواتا Polysemantic .

لە زمانی کوردیشدا ، وەکو هەمۆ زمانەکانی تر وشە هەن کە تەنها یەك مانایان هەیە و وشـەش هەن کە مانایان زۆرە ، بۆ نمونە دەبینین کە هەندێ وشـە ، وەك : ( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ....... هتد) لە یەك مانا زیاتریان نییە ، بەلاّم وشەش هەن مانایان زۆرە و ئەو مانایانەش لە یەك نێزیکن ، وەك :

بەردانەوە — ١ـ بەردانی ئاوی گیراو ؛
٢ـ فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

جۆش‌سەندن — ١ـ هاتنە کوڵی شتی شل لەسەر ئاگر ؛
٢ـ بڕیتی‌یە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ؛
٣ـ گەرم بوونی یەکێك لە کارێکدا .

بۆچ — ١ـ شتی بێ ناوکی بۆشی کاۆر ،
٢ـ بڕیتی‌یە لە قسە و گفتوگۆی بێ‌هوودە(٦).

فرەواتایی بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی ئەوە نیشان دەدات کە بەم زمانە دەتوانرێ باش تەعبیر بکرێت ، هەروەها شایانی باسە کە زوربەی ئەو وشانە بە ڕەسەن کوردین و لەناو جەرگەی کوردەواریدا هەڵقوڵاون .

جۆری مانا :

لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر مانای وشەی جیا بکرێنەوە :

١— مانای حەقیقی direct ( proper ) meaning . بەو مانایە دەوترێ کە ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان دەدات .

---

(٦) لە هێنانەوەی هەندێ نموونە و شەرح کردنی وشەدا سوودم لە چەند فەرهەنگێکی کوردی ، بەتایبەتی فەرهەنگی خاڵ وەرگرتوە .

٢– ماناى مەجازى Transfered meaning . بەو مانایە دەوترێ کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعیی واقیعی نیشان نادات ، بەڵکو لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانا دەدات .

بە وێنە وشەی « ئاگرنانەوە » لە زمانی کوردیدا بە مانای (ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسوتێ) و (هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشوبنانەوە) دێت . مانای یەکەمی ئەم وشەیە ـ ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسوتێ ـ کە مانایەکی حەقیقییە ئاشکرا دیارە کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعیی واقیعیی نیشان دەدات . بەڵام مانای دووەمی کە ـ هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشوبنانەوە ـ بە مانایەکی مەجازییە و راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعیی واقیعیی نیشان نادات ، چونکە ئاشکرا دیارە کە لەم روداوەیاندا (گڕگرتن و سوتاندن)ی تێدا نییە ، بەڵکو ئەم کارە کە (ناخۆشی و وێرانی و خراپی ...) لەدوایە ، لە ئەنجامی (گڕگرتن و سوتاندن)ەوە نزیکە . بەم جۆرە لە رێگای نزیکی و وێکچوون و پەیوەندی ئەو دوو روداوەوە ، وشەی « ئاگرنانەوە » بەو دوو مانایە ، واتە ـ حەقیقی و مەجازی ـ هاتووە .

هەرچی مانای مەجازییە لە زمانی کوردیدا پەیدا دەبێ لە ئەنجامی نزیکی و وێکچوونی :

١ــ شــێوه :

به وێنه وشەی « بارخستن » به مانای (کردنەوەی بار و خستنی له شـوێنێك) دێت و ئەمەش مانا حەقیقەتیکەیەتی . هەروەها بـه (کەوتنی مریشك و کەڵەشێریش لەسەر تەنیشت) هـەر دەڵێن « بارخستن » و ئەمەش مانایەکی مەجازییه . ئاشکرا دیاره که نێزیکی و وێـکچوون له شێوەی ئەو دوو ڕووداوەدا هەیه و ئەمەش بـووه بـه هۆی ئەوەی که ئەو مانا مەجازییه له ڕێـگای ئـەو مانا حەقیقیەوە ئەو مانایەی ناومان برد ببەخشێ .

٢ــ ئەرك و خاسیەت :

دەبینین که وشەی « نەرم » به هەمو شتێك دەوترێ که ڕەق نەبێت ، بەڵام له سـەرێـکی کەوه (مرۆڤی نەرم)یش هەیـه . بێگومان لێرەدا ئەو « نەرم »ە مانای ئـەوه نادات که مرۆڤ بـه لەش نەرم بێت ، بەڵـکو مەبەست ئەوەیه که مرۆڤێـکی لەسەرخۆ و ناسك و بەئەدەبه . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاسیەت و ئەرکی ئەم دوو مانایه نزیکن و وێـکچوون له نێوانیاندا هەیه .

٣ــ له مانایەکی فراوانەوه کەرتێـك ، وه له کەرتێـکەوه مانایەکی فراوان وەربگیرێ :

أ ــ وەرگرتنی کەرتێك له مانایەکی فراوانەوه .

بۆ نموونە دەبینین لە زمانی کوردیدا وشەی « بزرکان » مانایەکی گشتی هەیە ، ئەو مانایەش (تێکچوون و شـــپرزەبوونی گیانداره لە ترسانا) . لەم مانا گشتییەوە بەشێك وەرگیراوە ، ئەویش ئەوەیە کە بە (تێکچوونی شیر و ماست و هەندێ شتی تر کە گرۆ گرۆ دەبێ) دەڵێن « بزرکان » . یاخود وشەی « پشتیوان » بە شێوەیەکی گشتی مانای (یاریدەدەر)ە ، وە لەو مانا گشتییەوە ئـەوە پەیدا بووە کە وشەی « پشتیوان » بەو (دارە بوتڕێ کە لە باری پانی بە پشتی تای دەرگا و دەرابەدا دادەکوترێ) .

ب- فراوان بوونی مانایەکی تەسك .

بە وێنە دەبینین لە زمانی کوردیدا وشـــەی « باسقەندە » بە (داردەستێك دەوترێ کە لە داری بەلاڵوك دروست کرابێ) . بێشك ئەمە ناوە بۆ یەك شت ، بەلام لە هەمان کاتدا ئـــەم مانایە فراوان بووە و بە (هەموو دارێکی باریکی لووســی کون کراو کە کرابێ بە دەسکی قەندە) هەر دەوترێ « باسقەندە » .

پەیوەندی نێوان وشـــە :

لە بەکار هێنانی وشەدا بە مانای جیاواز لە ڕێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ وشەی تردا دەتوانرێ دوو جۆر وشە جیا بکرێتەوە :

١— وشەی بەرەڵڵا .

ئەم جۆرە وشانە دەتوانن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەدا پەیوەندییان هەبێ ، بە وێنە وشەی « مێز » لە رووی ئەندازەوە دەتوانرێ بوترێ ( بچووك ، گەورە ..... ) ، لە رووی شێوەوە ( خڕ ، درێژ ، کورت ، پان ، چوارگۆشە .... ) ، لە رووی رەنگەوە ( سپی ، سوور ... ) ، لە رووی پێویستییەوە ( نان خواردن ، نووسین .... ) ، لە رووی ئەوەی لە چی مادەیك دروست کراوە ( ئاسن ، دار .... ) ، لە رووی بەکار هێنان و نەوعیەتەوە ( باش ، جوان .... ) .... هتد .

٢— وشەی گیراو .

ئەمیش ئەو جۆرە وشانەن کە توانای ئەوەیان نییە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەدا یەك بگرن و لەبەر ئەوە شێوەی بەکار هێنانیان لە قاڵبێکی تەسکدا ماوەتەوە . بە وێنە وشەی « کەڕ ، کۆتەرە .... » لە زمانی کوردیدا ئەو توانایە و سەربەخۆییەیان نییە کە لەگەڵ ژمارەیەك پۆلی جیاوازی وشەدا رێك بکەون و بەکار بهێنرێن .

<u>وشەی هاوبێژ ( مشترك لفظی Homonym ) :</u>

چۆن لە گشت زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن کە بە خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ،

وەك :

ئازار — ئێشی ئەندام .
ئازار — مانگی مارت .
باو — دەستور : فیسار شت بووە بە باو .
باو — باوك .
باو — زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .

بێگومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین کە ماناکانیان زۆرە ـ واتە وشەی فرەواتا Polysemantic نین ، بەڵکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوە و نوسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتا و پەیدابونیاندا جیاوازن ، وەك : ( « ئازار » ـ ئێشی ئەندام ) کە وشەیەکی کوردییە زۆر دورە لە ( « ئازار » ـ مانگی مارت ) کە وشەیەکی کوردی نییە و لە پەیدابون و دروست بوندا سەرچاوەیەکی تری هەیە . یاخود « باو » دەبینین سێ وشەن کە ماناکانیان جیاوازە و لە یەك دورن . هەرچەندە هەر سێکیان لە رەسەندا کوردین ، بەڵام پەیدا بون و دروست بونیان لە رێگای جیاوازەوە هاتووە . جا ئەم جۆرە وشانە کە لە لێکسیکۆلۆژیدا وشەی هاوبێژ ( Homonym ) یان پێی دەڵێن ، پێویستە لەگەڵ وشەی فرەواتا ( Polysemantic ) دا جیابکرێنەوە و تێکەڵ نەکرێن[٧] .

---

(٧) بەداخەوە ، لەم رووەوە ـ واتە دەربارەی وشەی هاوبێژ و هاوواتا =

جۆری وشەی هاوبێژ :

لە زمانی کوردیدا سێ جۆر وشەی هاوبێژ بەرچاو دەکەون :

١ــ ئەو وشە هاوبێژانەی چۆن بە خوێندنەوە ، هەروەهاش بە نوسین وەك یەکن . بۆ نمونە :

= لە زمانی کوردیدا ــ نە بە زمانی کوردی و نە بە زمانی بێگانە هیچ شتێکی وەها نەنوسراوە و ئەمەش نانەواوییەکی زۆر و کەلەبەرێکی گەورەیە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا ، بەڵام ئەوەی شایانی باسە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە هەندێ لە زانایانی کورد ، وەك مامۆستایان ( تۆفیق وەهبی و قەنانی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ ) لە فەرهەنگەکانیاندا لە رێگای کۆشش و زانینی خۆیانەوە بە شێوەیەکی تەجروبی هەندێ کێشەی ئەم کارە ئاڵۆزەیان خاوکردۆتەوە . هەروەها لە لاپەڕە ( ٥٦٩ ــ ٦٢٣ )ی ، ژمارە دوی ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد »دا ( بەغدا ١٩٧٣ ) ، مامۆستا جەمال بابان لە ژێر ناوی « هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن »دا وتارێکی بلاوکردۆتەوە ، بەڵام کەم و کورتی و هەڵەی هەرە گەورەی ئەم باسە لەوەدایە کە نوسەر وشەی هاوبێژ و فرەواتای جیا نەکردۆتەوە ، بە وێنە :

ناوڵە ــ تەویلەی ولاغ .

ناوڵە ــ جۆرە باریبەکە کە بە بۆلی تەختە و زار دەکرێت .

تیرە ــ هۆز ، ئێل ،

تیرە ــ تیرەی بن کلاش .

ئەمانە و گەلێکی تر ــ کە زوربەی ئەو نمونانە دەگرنەوە کە=

ئاش — جۆی هاڕین و پاکردنی دانەوێڵە .
ئاش — چێشت .

٢— ئەو وشە هاوبێژانەی بە نوسین وەك یەکن ، بەڵام لە خوێندنەوەدا جیاوازییان هەیە ، وەك :

هەمانە[٨] — ( هە ) ـ رەگی کرداری ( هەبن )ە[٩]
(مان) ـ جێناوی لکاوی کۆیە
( ە ) ـ نیشانەی وجودە لە حاڵدا .

هەمانە[١٠] — کیسەیەك لە پێستی مەڕ و بزن دروست کرابێ .

٣— ئەو وشە هاوبێژانەی لە هەندێ حاڵەتی رێزماندا لەیەك نێزیك دەبنەوە ، وەك :

---

= مامۆستا جەمال بابان لە وتارەکەیدا هێناویتیەوە ـ لەو وشانە نین کە واتایەك زیاتر دەبەخشن ، وانە وشەی فرەواتا نین ، بەڵکو ئەو وشانەن کە لە رێگای چەند هۆیەکی تایبەتیەوە بە خوێندنەوە و نوسین وێكدەچن ، وانە ئەمانە وشەی هاوبێژن ، نەك فرەواتا .

(٨) لەم وشەیەدا گڕە وا بەسەر بڕگەی دووەمەوە .

(٩) ئەمە کردارێکە کە چاوگەکەی لە بیر چۆتەوە .

(١٠) لێرەدا گڕە وا بەسەر بڕگەی شەشەمەوە ( دوایینەوە ) .

تاڵه — گیانداری رەشی درێژ .

تاڵه — (تاڵ) ـ ئاوەڵناوە .

( ە ) ـ نیشانەی وجودی حاڵه .

بۆ — کوندەبەبۆ .

بۆ — کردارێکی رابوردووە کە لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراوە .

ڕێبازی پەیدابوونی وشەی هاوبێژ :

١— بوونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتێك لە زمانی کوردیدا هۆیەکی گرنگە لە پەیدابوونی وشـــەی هاوبێژدا . بە وێنە وشەی « بەش » لە دیالێکتی کرمانجی خوارووَدا مانای ( هێندێ لە شتێك کە بڕدرابێ بۆ یەکێك ) دەبەخشێ ، وە هـەر ئەم وشـەیە لە دیالێکتی کرمانجی ژوورووَدا بە ( گیانداری ناوچەوان سپی ) دەڵێن .

٢— لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کات و ڕۆژگاردا واتاکانی هەندێ وشەی فرەواتا لەیەك دوور کەوتوونەتەوە و وشەی هاوبێژیان دروست کردوە ، وەك :

زێ — ڕووباری زۆر گەورە .

زێ — زێی مێینە .

٣— چۆن لە مێژوی پەیدابونی وشەی گشت زمانێکدا، هەروەها لە مێژوی پەیدابونی وشەی کوردیدا وا رێکەوتووە کە دو وشە، یاخود پتر دابڕاون بەسەر شتی جیاوازدا و بە رێکەوت شێوەی دەربڕینیان وەك یەك بووە . بە وێنە :

باهۆ — شان و قۆڵ .

باهۆ — ئاسۆ .

٤— هەندێ وشە کە لە زمانی بێگانەوە کەوتونەتە ناو زمانی کوردییەوە ، وا رێکەوتووە لەگەڵ وشەیەکی کوردی رەسەندا لە نوسین و خوێندنەوەدا وەك یەك بن و لە هەمان کاتیشدا هەر یەکە مانای تایبەتی و جیاوازی خۆی هەبێت ، وەك :

بیر — بیر و هۆش .

بیر — ( بئر ـ عەرەبی ) .

جگە لەو چەند رێگە سەرەکیانە ، هەروەها هەندێك جار لە حاڵاتی گۆڕینی وشـــەدا و لکاندنی ئامراز و هـەروەهـا کورت کردنەوە و سوانەوە ، وشەی هاوبێژ پەیدا دەبێ .

بەم جۆرە دەبینین کە دەوڵەمەندی و فراوانی زمانی کوردی تەنها لە زۆری وشە و مانای جوێ جوێدا دەرناکەوێ ، بەڵـکو لە دەوری چالاك و سامانی بەرین و بەنرخی وشـــەی هاوبێژیشدا دەردەکەوێ .

## وشەی هاووواتا ( مرادف Synonym ) :

بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن ، یاخود مانایان لێك نزیکە ، بەڵام لە خوێندنەوە و نوسینیاندا جیاوازن ، وەك :

لێڕ - دارستان - جەنگەڵ .

ئاوارە - پەڕیوە - دەربەدەر .

جەندەك - کەلاك - تەرم - کەلەش .

توش - دژوار - سەخت - ناخۆش .

خەم - کەسەر - خەفەت .

خاپوور - وێران .

........................... هتد .

سەرچاوەی وشەی هاووواتا :

لە پەیدابون و کۆبونەوەی وشەی هاوواتای کوردیدا چەند رێگایەکی جیاواز دەوریان بینیوە :

١- چۆن بونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتیك لە زمانی کوردیدا بووە بە هوی پەیدابونی وشەی هاوبێژ ، هەروەها بوشە بە هۆی پەیدابونی گەلێك وشەی هاووواتا :

أ - بەشێك لەو وشەی هەوواتایانە لە خوێندنەوە و نوسیندا لەیەك دورن ، وەك :

ئەوَك — قوزَك .
گەلَك — گەلێك ـ فرە ـ پڕ ـ زۆر .
بەدەو — جوان ـ قەشەنگ ـ چەلەنگ .
باهوَر — باهۆر ـ رەشەبا .

ب) هەندێکیشیان ئەو وشە هاوواتایانەن کە لە خوێندنەوە و نوسیندا تا رادەیەك وێكدەچن ، بەلاَم لە شـــێوەی فۆنێتیکدا تۆزێك جیاوازی هەیە . ئەو جۆرە وشانەش لە ئەنجامی لێك نزیك بونەوەی هەندێ دەنگ ، یاخود لە ئەنجامی خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی کوردیدا پەیدا بوون ، وەك :

م / و دامێن ـ داوێن .
هـ / و هشك ـ وشك .
ف / و چاف ـ چاو .
ی / وَ پاری ـ پاروَ .
هـ / ی تەنیا ـ تەنها .
آ / ێ ما ـ مێ .
ئـ / هـ ئەسپ ـ هەسپ
...................... وە گەلێکی تر[11] .

---

(۱۱) ئەم جۆرە وشە هاوواتایانە کە لە ئەنجامی نزیکی دەنگە ، یاخود خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی زمانەکەمانەوە هاتون ، پتر بەبوەندیباز=

٢ـ لە ئەنجامی بەکار هێنانی شێوازی جودا لە چۆنێتی داڕشتن و دروسـت کردنی وشـەدا گەلێك وشەی هاوواتا لە زمانی کوردیدا پەیدابوون ، وەك :

بەرەوژێر — بەرەوخوار

بەرەوخوارکە — بەرەوخوارە

بـەرەولێژە — سەرەولێژە

٣ـ هەرچەندە لە زمانی کوردیدا بۆ هەندێ مانا وشەی رەسەنی کوردی هەبوون ، بەلام لەگـەڵ ئەوەشدا وا رێکەوتووە کە بۆ هەمان مانا لە زمانی بێگانەوە وشە بکەونە زمانەکەمانەوە و لەگەڵ وشـــە کوردییەکاندا ببن بە هاوواتا ، وەك :

زەوی — ئەرز — عەرد ، — هەرد .

مەردوم — مرۆ — مرۆڤ — ئادەمیزاد — ئینسان .

هـەژار — بەلەنگاز — فەقیر .

وشەی دژواتا Antonym :

لە ســـەرەوە رۆنمان کردەوە کە لە نیوان ژمارەیەکی زۆر لە

---

= بە بـای فۆنیتیکەوە هەیە ، جا هەر لە بەر ئەوەشە کە لەم رووەوە شتێکی کەمم نوسیوە . دەربارەی ئەم جۆرە وشانە باسێکی سەربەخۆم هەیە ، هیوادارم بەم زوانە بە وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

وشەکانی زمانی کوردیدا پەیوەندیی هاوواتایی هەیە. هەروەها پەنجەش بۆ ئەوە رادەکێشین کە پەیوەندیی دژواتایش لە زمانەکەماندا دەوری خۆی دەبینێ .

وشەی دژواتا بەو وشانە دەوترێ کە لە ماناداا بەرامبەر یەکتر دژ وەستاون ، وەك :

گەورە — بچوك .
زۆر — کەم .
بەرز — نزم .
چاك — خراپ .
دوور — نزیك .
رووناك — تاریك .

لەو نموونانەی سەرەوەدا ئاشکرا دیارە کە هەر وشەیەك رەگی جیاوازی خۆی هەیە ، هەروەها وشەی دژواتا دەتوانن خاوەنی یەك رەگ بن ، وەك :

خۆش — ناخۆش .
راست — ناڕاست .
بەنرخ — بێ نرخ .

پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین کە وەنەبێ هەموو وشەیەکی

زمانی کوردی بەرامبەری وشەی دژواتا هەبێت . بۆ نموونە بەرامبەر هەندێ ناو ، وەك : خانوو ، دەرگا ، کتێب ، وشتر .....؛ زوربەی جێناو ؛ تێکڕای ژمارە وشەی دژواتا نییە .

# ئێتیمۆلۆژی ( الاتیمولوجیا ETYMOLOGY )[1]

ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە ، کە لە پەیدابـوون و وەرگرتن و گەشـە کردنی وشە و ئەو دەورانەی پێیـــدا تێپەڕیوە دەدوێ .

موفرەداتی زمانی کوردیی تاڵبۆوەی سالانی دوور و درێـــژی مێژووی گەلی کوردە و سوورە و تۆرەی چەندین پلە و قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیانی هات و نەهاتێتی . لەو ماوە درێژ و بەرفرەوانەدا کە بە سروشت لە کەو دراون و گێژە کراون و گورگە و بنۆیـل و زێوانیان لێ گیراوە ، لە زۆر ڕووی گرنگەوە پتـــەو بووە و بە

(١) لە لاپەڕە ١ ی ئـەم کـتێبەدا بە هەڵە بەرامبـەر بە ( ئێتیمۆلۆژی ) نوو-ـراوە : ( وشـەداتاشین ـ الاشـتقاق ) . بەلام راسـتیەکەی : ( ئێتیمۆلۆژی ـ الاتیمولوجیـا : دراسـة تعنى باصـل الـكلمات وتاريخها ) یە .

خۆدا هاتۆتەوەو دەوڵەمەند بووە .

پەیدابوون و گەشە کردنی موفرەداتی زمانی کوردی ، وەکو هەموو زمانەکانی سەر ڕوی ئەم زەمینە لە دوو ڕێگەوە سەری هەڵداوە . یەك ـ ڕێگەی ڕاستەوخۆ کە ئەویش هەڵێنجانی وشەی کوردی ڕەسەنە لە نێو زمانی کوردیدا ؛ دوو ـ ڕێگەی لاوەکی ، کە ئەویش وەرگرتنی وشەیە لە زمانانی بێگانەوە .

بەم جۆرە لە لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردیدا ، پێویستە بەتایبەتی بنجی زمانی کوردی ساغ بکرێتەوە ؛ وشەی ڕەسەنی کوردی و وشەی ئێرانی و هیند و ئەورووپایی دەست نیشان بکرێن ؛ وشەی بێگانە و ڕەگی بێگانە لە زمانی کوردیدا نیشان بدرێن ؛ چالاکی وسستی موفرەداتی زمانی کوردی بخرێتە پێش چاو ... هتد .

* * *

لەسەر ڕوی ئەم زەمینە بە ژماردنێکی تەقدیری پتر لە دوو هەزار و پێنج صەد زمان هەن . وەك ئاشکرایە ، دیارکردنی ژمارەی تێکڕای زمانەکانی جیهان کارێکی سەخت و گرانە ، ئەویش بەر لە هەموو شتێك پەیوەندە بەوەی ، کە وا لە زۆر ڕووەوە لێکۆڵینەوەی تەواو و پێویست کەمە . وە هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە ئاشکرا و ڕوون نییە ، ئایا هەندێ زمان زمانێکی سەربەخۆیە یاخود دیالێکتی زمانێکی دیکەیە . لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین

کە لە دیارکردنی سەربەخۆیی زماندا کەم و زۆری خاوەنی ئەو زمانە ناتوانێ دەور ببینێت ، بە وێنە هەندێ دیالێکت هەن کە بە ملیۆنەها کەس پێی دەدوێن ، کەچی زمانی وا هەیە کە خاوەنەکانی تەنیا چەند هەزار کەسێك دەبن . زمان هەیە ژمارەیەکی کەم کەس پێی دەدوێ ، وەك ( زمانی خێڵەکانی ئەفەریقا ، پۆلینیزی[2] ، زمانی هندییەکانی ئەمەریکا ، زمانەکانی داغستان ... ) . هەندێ زمانیش هەن میللەتێکی گەورە پێی دەدوێ ، وەك ( چینی ، رووسی ، عەرەبی ... ) . زمانی وەهاش هەیە کە چەند نەتەوەیەك پێی دەدوێن ، بە نموونە ( زمانی فەرەنسی ـ لە فەرەنسا و بەلجیکا و سویسرا ؛ زمانی ئینگلیزی ـ لە بەریتانیا و ئەمەریکا ؛ زمانی ئەڵەمانی ـ لە ئەڵەمانیا و نەمسا ؛ زمانی ئیسپانی ـ لە ئیسپانیا و بیست کۆماری خوارووی و ناوەڕاستی ئەمەریکا ؛ ... ) . چەند زمانێکیش هەن کە بوونەتە زمانی نێومیللەتان International language و لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و گەلێك رێکخراو و کۆمەڵەی جیهانیدا پێی دەدوێن و پێی بڵاودەکەنەوە ، وەك ( ئینگلیزی ، فەرەنسی ، رووسی ، ئیسپانی ... ) .

---

(2) ئەمە زمانی نەتەوەی پۆلینیزە ، کە لە پۆلینیزیا و هەندێ لە دوورگەکانی رۆژهەڵاتی میلانیزیا دەژین . ژمارەی خاوەنی ئەم زمانە نزیکەی (340) هەزار کەس دەبێت . ئەوەی سەرنج رابکێشێ ، ئەوەیە کە ئەم زمانە خاوەنی فۆنەتیکێکی زۆر سادە و ساکارە . زۆری دەنگی بزوێن لە گەلێ وشەدا ساز و ئاوازێکی خۆشی بەخشیوە . وشەی وای هەیە کە تەنیا لە دەنگی بزوێن پێکهاتووە ، وەك : ( oiaio , oe ... هتد ) .

هەروەها زمانی وا هەن کە بە نیسبەت زمانەکانی ئەمڕۆوە بە زمانێکی مردوو دادەنرێن ، بەڵام لە هەندێ ڕووەوە سوودیان لێ دەبینرێ و بەکار دەهێنرێن ، بەتایبەتی زمانی لاتینی ، کە زمانی کەنیشت و زانست و زاراوە ...

مێژووی گشت زمانەکانی جیهان وەك یەك ئاشکرا نین . زمانی وا هەیە کە لە ڕێگای ئاسەواری نووسراویانەوە مێژووی لە ماوەی ٢٠ ـ ٣٠ سەدەدا ناسراوە ، بە وێنە زمانی یۆنانی هەر لە ( هۆمیرۆس )ەوە تا ئەم دەورەی زاراوە ، یاخود زمانە هیند و ئەورووپاییەکانی هندستان هەر لە دەمی سروودەکانی ( ریکفیدا )ەوە تا زمانە هندییەکانی ئەمڕۆ ناسراون .

هەر لە نێو زمانە هند و ئەورووپاییەکاندا زمانی وا هەن ، کە خاوەنی نووسراوی ئێجگار دێرینن ، بەڵام زانست دەربارەی ئەو زمانانە تەنیا لە سەدەی بیستەمدا زانیاری وەرگرتووە ، وەك زمانی ( تۆخاری ) کە بەر لە سەدەی حەوتەمی پ . ز . لە ناوچەی ڕۆژئاوای چین پێی دەدوان ... هتد .

زمانی وەهاش هەن ، کە مێژوویان لە نێوان سەدەکانی ٤ ـ ٨ زدا ناسراوە ، وەك ( گێرمانێکان ، سلاڤێکان ، ئەرمەنی ، جۆرجی ... ) .

چەند زمانێکیش هەن ، کە تەنیا مێژووی ئەم چوار ـ پێنج سەدەیەیان ئاشکرایە ، وەك زمانی ( لاتیشی ، ئەلبانی ... ) .

زوربەی زمانەکانی ئەفەریقا و ئوستڕالیا و ئەمەریکا لە سەدەکانی (١٧ ـ ١٨)ی زایینیدا ناسراون و تەنانەت هەندێکیشیان لە سەدەکانی (١٩ ـ ٢٠)دا .

تێکڕای زمانەکانی جیهان بەسەر چەند کۆمەڵە زمانێکی گەورەدا دابەش دەبن و هەر کۆمەڵێکیش بەسەر چەند خێزانێکدا . زمانی کوردی یەکێکە لە کۆمەڵی گەورەی زمانە هیند و ئەورووپاییەکان و خێزانی ئێرانی . جا بەو بۆنەیەوە لێرەدا بەتایبەتی باسی خێزانی زمانە ئێرانیەکان دەکەین[٣] .

## خێزانی زمانە ئێرانیەکان

خێزانی زمانە ئێرانیەکان لە ژمارەیەك زمانی زیندوو و مردوو پێکهاتووە :

أ ـ زمانە ئێرانییە زیندووەکان

١ ـ فارسی نوێ

٢ ـ کوردی

٣ ـ ئەفغانی

---

(٣) بەداخەوە ، لێرەدا ماسەکە ڕێگای ئەومان نادات کە بە دوور و درێژی لە تێکڕای کۆمەڵی زمانەکانی جیهان بدوێین . بەڵام لە بارەیەوە باسێکی تایبەتیمان هەیە ، هیوادارم بەم زووانە بە چەند وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز .

٤ ـ بلوجی

٥ ـ تاجیکی

٦ ـ ئۆسیتی

٧ ـ تاتی

٨ ـ تالیشی

٩ ـ پامێری

١٠ـ مازەندەرانی ، گیلیانی

.............. هتد

ب ـ زمانە ئێرانییە مردووەکان :

١ ـ فارسی کۆن(٤)

٢ ـ ئاوێستایی(٥)

٣ ـ پەهلەوی(٦)

---

(٤) زمانی زەمانی هەخامەنشێکانە ، سەدەی ٦ ـ ٤ پ ز .

(٥) واتە ئەو زمانەی کە ( ئاوێستا )ی پێ نوسراوە و ـکە زمانی ئاینی ( زەردەشت )ە . دێرینترین مێژوی کە مێژوناس و زمانناسەکان پەسەندیان کردبێ ، سەدەی ( ٧ ـ ٦ )ی پ. زە کۆنترین و بەنرخترین بەشی ( ئاوێستا )ش ئەو سرودانەن کە لە لایەن ( زەردەشت )ەوە وتراون . ئەم بەشەی ( ئاوێستا ) ناوی ( گاتەها )یە و بەشەکانی تری بە ( یەسنا ، ویسپارت ، یەشت ، دیفس ..... ) ناسراون .

(٦) هەروەها پێی دەوترێت ( فارسی ناوەڕاست ) ، کە زمانی ئاینی و دەوڵەتی ساسانیێکان بووە .

٤ ـ میدی[٧]

٥ ـ پارثی[٨]

٦ ـ سەغدی ( سوگدی )[٩]

٧ ـ سەکی[١٠]

زوربەی ئێراناسەکان بە گوێرەی شوێن زمانە ئێرانییە زیندوو و مردووەکان دابەش دەکەن بەسەر :

---

(٧) زمانی میدییەکانە ، کە بەر لە زایین بە چەند سەدەیەك توانیویانە دەوڵەتێکی دەسەڵاتداری گەورە لە رۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆدا دابمەزرێنن . گەلێك لە زانایان کورد بە نەوەی میدییەکان دادەنێن . بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو دەربارەی میدییەکان و زمانی میدی ، بڕوانە : کورد نەوەی میدییەکانن ، نوسینی پرۆفیسۆر ڤلادیمیر مینۆرسکی ، کۆڕبن و لێدوانی د. کەمال مەزهەر ( بە زمانی عەرەبی ) ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، بەغدا ١٩٧٣ ، ل ٥٦٠ .

(٨) یەکێکە لە زمانە فارسییەکانی پلەی ناوەڕاست ، لە نێوان سەدەکانی ٣ پ ز. و ٣ پ. زدا ، کە لە ناوچەی خوارووی رۆژهەڵاتی دەریای قەزویندا بەکار هێنراوە .

(٩) یەکێکە لە زمانە ئێرانییە رۆژهەڵاتییەکان . لە کۆتایی سەدەی ١ی پ. ز. تا ٩ی ز. ژیاوە .

(١٠) یەکێکە لە زمانە رۆژهەڵاتییە مردوە ئێرانییەکانی دەوری ناوەڕاست و لە سەدەکانی ٥ ـ ١٠ ی زایینیدا لە ئاسیای ناوەڕاست و تورکەستانی چین بلاوبوبۆوە . هەندێ تێکستی ئەم زمانە بەجێ ماون ، کە بە خەتی هیندی نوسراون .

أ ) زمانە ئێرانییە رۆژئاواییەکان :

١ ـ بەشی خوارووی رۆژئاوا ـ فارسی کۆن و ناوەڕاست و نوێ ، تاجیکی ، تاتی ... و هەندێکی تر .

٢ ـ بەشی سەرووی رۆژئاوا ـ میدی ، پارثی ، بلوجی ، کوردی ، تالیشی ... هتد .

ب) زمانە ئێرانییە رۆژهەڵاتێکان :

١ ـ بەشی خوارووی رۆژهەڵات ـ سەغدی ، ئەفغانی ، پامیری ... هتد .

٢ ـ بەشی سەرووی رۆژهەڵات ـ سەکی ، ئۆسیتی .... و هەندێکی تر .

زمانە ئێرانێکان بە سێ دەوری مێژوویيدا رۆیشتوون : کۆن و ناوەڕاست و نوێ :

١ ـ دەوری کۆن ـ لە (ئاوێستا)وە دەست پێ دەکا ـ واتە سەدەکانی ١٠ ـ ٦ پ. ز. زمانە ئێرانییە کۆنەکان پەیدا بوون لە : ئاوێستایی ، فارسی کۆن ، سەکی ، میدی ... هتد .

٢ ـ دەوری ناوەڕاست ـ لە کۆتایی دەوری یەکەمەوە دەست پێ دەکا تاکو داهاتنی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمدا . لە مێژوودا بە تێکڕای زمانەکانی ئەم دەورە دەوترێ (پەهلەوی) . زمانە ئێرانێکانی

ناوەڕاست بریتین لە : فارسی ناوەڕاست ـ پەهلەوی ، سـەغدی ، پارتی ... هتد

٣ـ دەوری نوێ ـ ئەم دەورەی زمانە ئێرانیێـکان لە سەدەی نۆیەمی دوای زایینەوە دەست پێ دەکا . زمانە ئێرانیێـکانی ئەم دەورە پێکهاتوون لە : فارسی نوێ ، کوردی ، ئەفغانی ، تاجیکی ، بلوجی ، پامیری ، ئۆسیتی ... هتد(١١).

بەم جۆرە دەبینین کە زمانی کوردی زمانێکی سـەربەخۆ و زیندوی ئێرانییە و یەکێکە لە بەهێ سەروی رۆژئاوای خێزانی زمانە ئێرانیێـکان . خێزانی ئێرانیش بەشێکە لە کۆمەڵی هند و ئەوروپایی ، ( Indo - European ) .

تا ئەم شوێنە لە بنجی زمانی کوردی دواین و بڕێك لە مەسەلەی ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردیمان رون کردەوە . لێرەش بە دواوە لە چەند لایەنێکی تری پێویستی باسەکە دەکۆڵینەوە ، کە ئەویش هەندێ روی گرنگی وشەکانی زمانی کوردییە .

---

(١١) دەربارەی ئەم سێ دەورە ، کە زمانە ئێرانیێکان پێیدا رۆیشتون ، بە زمانی کوردی چەند وتارێك بلاوکراونەتەوە و بەتایبەتی لە نێوانیاندا وتارەکانی د. پاکیزە رەفیق حیلمی و د. کەمال فوئاد دیارن ، وەك :

أ ) د. پاکیزە رەفیـق حیلمی ، زمانی کوردی « دەفتـەری کوردەواری » ، بەغدا ١٩٧٠ ، ب ٣ ، ل ١٠٤ ـ ١١٠ .

ب) د. کەمال فوئاد ، زمانـە ئینـدۆ ـ ئەوروپیێکان ، گۆڤاری « پرشنگ » ، بەرلین ١٩٦٦ ، ژ٥ ، ل ٢٠ ـ ٢٤ .

## وشەی کوردیی پەتی (ڕەسەن) :

زمانی کوردیی بە تێکڕایی و وشەکانی زمانەکەمان بەو شێوەیەی ئەمڕۆی کە هەیە ، بەرهەمی تێپەڕبوونی چەندەها سەدەیە و ئەنجامی پێشکەوتنێکی زۆر و دوور و درێژە لە نێوان ئەو وشانەدا ، کە ئێستا لە ئاخاوتنی زمانەکەماندا بەکار دەهێنرێن ، وشەی زۆر جیاواز و جودا دروست بوون ، کە لە شێوەی پەیدابوون و داڕشتنیانـــدا دەردەکەون و دەبینرێن . لەتەك ئەو وشانەدا کە بەر لە پەیـدابوونی نووسینەوە لە زمانی کوردیدا بەکار هێنراون ، وەك (دایك ، باوك ، برا ، خـــوشك ، پیر ، سپی ، ڕەش ، سێ ، چی ... هتد ، چاومان بە وشەی وەهاش دەکەوێ کە تازە پەیدابوون و زۆر نییە کەوتوونە نـاوانەوە ، وەك (خوێنەر ، ژیننامە ( ترجمة الحـال ) ، بزوێن ( Vowels ) .. وە گەلێکی تر) . لەپاڵ وشـــەی ڕەسەنی کوردیدا ، وەك (شەو ، زۆر ، سەر ، ژن ، چوون ... هتد) وشەش دەبینرێ کە لە زمانی بێگانەوە کەوتوونەتە زمانەکەمانەوە ، وەك (حەج ، زەکات ... ـ لە عەرەبییەوە) ؛ دامە ، خاشخاش ... ـ لە فارسییەوە) ؛ (خان ، خاتوون ... ـ لە تورکییەوە) ؛ ( فەیلەسووف ، ئەڵماس ... ـ لە یۆنانییەوە) ؛ (دیکتاتۆر ، کۆنسول ... ـ لە لاتینییەوە) ؛ (ملیۆن ، ڕژێم ... ـ لە فەرەنسییەوە) ؛ (سەماوەر ، بۆلشەفیك ... ـ لە ڕووسییەوە) ... هتد[١٢] .

(١٢) ڕاستە هەندێ وشەی لاتینی و یۆنانـی و ئینگلیزی و فەرەنسی ... لە=

کەرەستەی سەرەکیی زمانی ئەمڕۆی نەتەوەی کورد و موفرەداتی زمانی کوردیی لە درێژایی هەموو دەورەکانی پێشکەوتنیدا بریتییە لە وشەی رەسەنی کوردیی . بەشی هەرە زۆری موفرەداتی ئەمڕۆی زمانی کوردیی ئەو وشە کوردییە رەسەنانەن کە لە ناو جەرگەی کوردستاندا هەڵقوڵاون و کورد دایهێناون و شێوە و خاسیەتی کورد و کوردستانیان پێ دراون و بوونەتە ئاوێنەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ... میللەتی کورد .

بەشی زۆری وشەی کوردیی رەسەن ، ئەو وشانەن کە لە دروست بوون و داڕشتن و شێواز و دەستووری زماندا پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە و لەو دەمەوە پەیدا بوون کە زمانی فارسی و کوردیی و ئەفغانی و بلوجی و تاجیکی و ئۆسیتی و تاتی و تالیشی و پامیری و . . لە خێزانی زمانە ئێرانییەکان کەوتوونەتەوە ـ واتە بەشی زۆری موفرەداتی زمانی کوردیی وشەی کوردیی رەسەنن .

وشەی کوردیی رەسەن ئەو وشانەن کە لە سەدەی نۆیەمی دوای

= رێگای زمانی عەرەبی و فارسی و تورکییەوە هاتوونەتە زمانی کوردییەوە ، بەڵام ئێمە لێرەدا گرنگیمان بەوە داوە ، کە ئەو وشانەی نیشانمان داون بە رەسەن کوردیی نین و کورد وەری گرتوون . بوونی وشەی بێگانەش لە زمانی کوردیدا ، ئەوە ناگەیەنێ کە زمانی کوردیی زمانێکی رەسەن و سەربەخۆ نەبێ ، بەڵکو ئەمەش دیاردەیەکە کە لە تێکڕای زمانەکانی جیهاندا هەیە .

زایینەوە هەتا ئەمڕۆ پەیدابوون . ئەم جۆرە وشانە خاسیەتی وتوویژی کوردییان هەیە و بێ‌گومان بۆنیان لە زمانێکی تردا ، ئەوە نیشان دەدەن ، کە لە زمانی کوردییەوە وەرگیراون .

## وشەی ئێرانی :

لە نێوان وشەی رەسەنی کوردیدا گەلێك وشەی گرنگ هەن کە بە رەگەز ئێرانین . ئەو جۆرە وشانە مێژوویەکی کۆنیان هەیە و بە نیسبەت زمانی کوردی و زمانە ئێرانیەکانی ترەوە میراتییەکی گرنگ و بەنرخن ( بە وێنە بڕوانە : خشتەی ژمارە ۱ ) . ئەسەری ئێرانی بە تایبەتی لە ژمارە و جێناودا دەبینرێ ، وەك : ( یەك ، دوو ، سێ ، ... حەوت ، دە ... ؛ تۆ ، ئەو ، ئێوە ، کێ ، چی ... ) .

هەروەها پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین کە گەلێك وشە هەن کە لە فارسی و کوردی و ئەفغانی و تاجیکی ... دا وێکدەچن ، بەڵام پەیوەندییان بەیەکەوە نییەوە و لە پەیدابوون و دروست بوونیاندا پێکەوە نەبەستراون و بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەسەر بناغەی رەگ و پێشگر و پاشگر ... ی وێکچوو وەرگیراون ، بە وێنە بڕوانە : خشتەی ژمارە[1] .

# خشتەی ژمارە ١

| زمانە ئێرانیە رۆژئاوایەکان | | | | | | | زمانە ئێرانیە رۆژهەڵاتیەکان | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کوردی | | | | | | | | |
| کرمانجی ژوورو | کرمانجی خوارو | فارسی | تاجیکی | تاتی | بلوچی | تاڵیشی | ئەفغانی | ئۆسیتی |
| پەرس | پرس | پورس | پورس | پۆرس | پورس | پورس | پەخت | پەرس |
| ئاف | ئاو | ئاب | ئۆب | ئاو | ئاف | ئوف | ئۆبە | ئاپ |
| رۆژ | رۆژ | روز | رۆز | روز | رۆچ | رۆژ | روەدز | رودزەنك |
| بەرا | برا | برادەر | بارودەر | برار | براس | بو ، بوا | ورور | ئەرفەدە |
| سەر | سەر | سەر | سەر | سەر | سەر | سە | سەر | سەد |
| هەسپ | ئەسپ | ئەسپ | ئەسپ | ئەس | ئەسپ | ئەسپ | ئەس | ئەفسە |
| دە | دە | دە | دە | دە | دە | دە | لەس | دەس |
| سەد | سەد | سەد | سەد | سەد | سەد | سە | سەل | سەدە |
| چاف | چاو | چەشم | چەشم | چوم | چەم | چەش | چەم | چەستە |

### وشەی هند و ئەوروَپایی :

لە نێوان وشەی کوردی و ئێرانیدا وشەش هەن کە بنجی هند و ئەوروَپاییان هەیە ، وەك : برا ، زاوا ، برۆ ، نولی ... وە گەلێکی تر (هەروەها بڕوانە خشـــتەی ژمارە ٢ کە نێزیکی زمانە هیند و ئەوروَپاییەکان لە ژمارەدا نیشان دەدا ) .

### وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا :

لەتەك وشەی پەتی و رەسەنی کوردیدا لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر وشـەی بێگانە هەن ، کە لە زمانانی ترەوە هاتوونەتە زمانەکمانەوە .

وشەی بێگانە بە تێکڕایی بەو وشانە دەوترێن کە لە هـــەر زمانێکی بێگانەوە بێت کەوتبنـــە زمانی کوردییەوە ، ئەگەرچی لە روَی پێکهاتنی (موَرفێم)ەوە[13] لەگەڵ وشەی کوردی رەسـەندا هیچ جیاوازییەکیان نەبێت .

پێویستە ئەوەش بهێنینەوە یاد کە لەسەر روَی زەمیندا هیـــچ زمانێك نییە کە لە تاسیری زمانی بێگانە ئازاد بێت ، یاخود تاسیری زمانی بێگانەی لەسەر نەبێت . هەروەها هیـــچ میللەتێك یاخـود

---

(١٣) موَرفێم (motpheme) ـ بچوکترین پارچەی واتاداری زمانە . بـوَ وەرگرتنی زانیاری تەواو دەربارەی موَرفێم ، بڕوانە : محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلوَلوَژی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ٢٣ .

# خشتەی ژمارە ٢*

| کوردی | فارسی | هیندی | ئەڵمانی | ئینگلیزی | ئیتالی | فەرەنسی | ڕوسی | بولگاری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەك | یەك | ئێك | ئاینس | وان | ئۆنۆ | ئان | ئەدین | ئیدەن |
| دوَ | دۆ | دوێ | تزڤای | تو | دوێ | دوێ | دڤا | دڤا |
| سێ | سیە | تین | درای | ثری | تری | تروا | تری | تری |
| چوار | چەهار | چار | فیر | فۆر | کواترۆ | کاتر | چیتیری | چیتیری |
| پێنج | پەنج | پانج | فیونف | فایف | ئچینکوێ | سانك | پیات | پێیەت |
| شەش | شیش | چۆ | زێکس | سیکس | سی | سیز | شێست | شێست |
| حەوت | هەفت | سات | زیبن | سێڤن | ستێ | سیت | سێم | سیدەم |
| هەشت | هەشت | ئەت | ئاخت | ئەیت | ئۆتو | ویت | ڤۆسیم | ئۆسەم |
| نۆ | نە | نۆ | نۆین | ناین | نۆڤێ | نۆف | دێڤیت | دێڤەت |
| دە | دە | دەس | تزێن | تێن | دیێشی | دیز | دێست | دێسەت |

(*) جگە لە زانیاری خۆم ، لە سازکردنی هەردوو خشتەی ژمارە (١) و (٢)دا سوودم لە کتێبی : (س. ئا. سۆکۆلۆف ، زمانە ئێرانێکان ، مۆسکۆ ١٩٦١ ، وەرگرتووە . وە بۆ خشتەی ژمارە (٢) ، جگە لەو=

هەڵگری هەر زمانێك بەرەهایی بە شێوەیەكی تایبـەتی و جیاواز و دوور لە میللەتانی نازی .

خاسیەتی كۆمەڵایەتی وتوویژی سروشت و رووداوی مێژوویی ، كە پێشكەوتنی كۆمەڵ دیار دەكەن ، دەبنە هـۆی ئەوەی كاری زمانێك بەسەر زمانێـكی دیكەوە ببێت و زمانێك لە زمانێـكی كەوە شـت وەربگرێ . ئەم دیاردەیەش پتر لە موفرەداتی زماندا دەردەكەوێ .

لە ئەنجامی پەیوەندیی دوور و درێژی ئابـووری و سیاســی و جەنگی و كولتووری ... میللەتی كورد لەگەڵ میللەتانی تردا ، گەلێك رەگەز (عنصر)ی وشە هاتوونەتە زمانی كوردییەوە و لە دەسـتووریدا بنجی خۆیان پتەو كردوە .

ئەم دیاردەیە ـ واتە كاری زمانی بێگانە و وەرگرتنی وشـەی بێگانە ، وەنەبێ كارێـكی خراپ و زیان بەخش بێ ، بەڵـكو بـە پێچەوانەوە زمانی ئێمەیان دەوڵەمەند و فـراوان و بەرین كردوە . بێ گومان ئەوەی كورد لە بێـگانەی وەرگرتوە خستویەتیە ژێر باری فۆنەتیك و وشە داڕشتن و دەسـتوور و رێزمانی كوردییەوە و بەمە بەرگێـكی كوردیی بە بەریاندا كردوە .

وەك ئاشكرایە ، بەشـی هەرە زۆری ئەو وشە بێـگانانەی لە

---

= سەرچاوانەی ناومان بردن ، هەروەهـا ئەو خشـتەیەی مامۆستا طاهر صادق لە كتێبی : ( رێنوس . چۆنیەتی نوسـینی كـوردی ، كەركوك ١٩٦٩ ، ل ١٤١ )دا دایناوە كەڵـكمان لێ وەرگرتوە .

زمانی کوردیدا هەن ، لە زمانی فارســـی و عەرەبی و تورکییەوە وەرگیراون . بێگومان هۆی ئەمەش روون و دیارە .

### وشەی فارسی لە زمانی کوردیدا :

لە نێو ئەو وشە بێگانانەدا کە کەوتوونەتە زمانی کوردییەوە ، بەشێکی زۆریان لە زمانی فارســـییەوە ـ کە لەگەڵ زمانی کوردیدا لە یەك خێزانی زمانن ـ وەرگیراون[١٤] . هـــۆی پەیدابوون و پتەوبوونی ئەو وشانەش لە زمانی کوردیدا ، ئەو مێژووە دوور و درێژەیە کە ئـــەم دوو میللەتە ( کورد و فارس ـ ئەوڕەحمان ) لە تێکەڵاویدا هەیان بووە . بە وێنە وشـــەی « سروشـــت »[١٥] ، « نمـایش » ، « وەرزش » ، « نایاب »[١٦] ، « ئەندێشە » ، « باڵوێز »[١٧] .... هتد .

---

(١٤) لەتەك ئەو وشانەدا کە لە فارسییەوە کەوتوونەتە زمانی کوردییەوە هەروەها هەندێ رەگی فرازیۆلۆژی و وشە داناشین و شێوەی رێزمانی و داڕشتنی رستە لە زمانی فارسییەوە وەرگیراون .

(١٥) فارسییەکەی « سرشت »ە و کورد کردوویە بە « سروشت » .

(١٦) لە فارســـیدا بە مانای « نادر » ـ « بەدەگمەن » هاتوە . بە نموونە دەڵێن « گوشت در بازار نایابست » ـ « گۆشت لە بازار دەست ناکەوێ » ، بەڵام کورد وەری گرتوە و تا رادەیەك مانای گۆڕیوە و بە واتـــای « فاخر » ـ « زۆرباش » بەکاری هێناوە . ئەم جۆرە رووداوانەش لە وەرگرتنی وشەی بێـگـانەدا ، لە زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەون .

(١٧) وشەی « باڵوێز » فارس تازە دروستی کردوە و کورد لێی وەرگرتوە .

## وشەی عەرەبی لە زمانی کوردیدا :

هەروەها لە زمانی کوردیدا زۆر وشە هەن کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون . سەرەتای ئەم روداوە ، واتە هاتنە ناوەوەی ئەو وشانە بۆ زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ پەیدابونی ئیسلام و دراوسێتی و تێکەڵاوی کورد لەگەڵ عەرەبدا[١٨] .

کورد چۆن وشەی هەر زمانێکی بێگانەی وەرگرتوە و شێوە و بەرگی کوردی کردوە بە بەردا ، هەر بەو جۆرەش وشەی عەرەبی وەرگرتوە و خستویەتیە ژێر باری پێشکەوتنی یاسای زمانەکەیەوە . دەستکاری کردنی وشەی عەرەبی لە چەند رێگایەکەوە بووە : یەکێك لەو دەستکارییانە لە روی دەنگ و (تلفظ)ەوە بووە . بۆ نمونە ئەگەر لە وشەیەکی عەرەبیدا دەنگێك هەبوبێ کە لەگەڵ یاسای فۆنەتیکی زمانی کوردیدا رێك نەکەوتبێ ، ئەوە گۆڕانێکی بەسەرا هێنراوە ، بە وێنە دەبینین دەنگی (ث ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ذ ....) کە لە گەلێك وشەی عەرەبیدا هەن ، لە کوردیدا کراون بە (س ، ت ، ز ....) .

---

(١٨) بێشك ، ئەم دیاردەیە بە پێچەوانەشەوە روی داوە و لە زمانی کوردییەوە گەلێك وشە کەوتۆتە زمانی عەرەبییەوە ، وەك « گوێز – جوز » ، « سزا – جزا » ، « گێزەر – جذر » ..... هتد .

چەند نموونەیەك :

| | |
|---|---|
| ص ، ث / س | صابر ـ سابیر |
| | مقص ـ مقەست |
| | ثروة ـ سەروەت |
| | اثبات ـ ئیسپات |
| ط / ت | طابو ـ تاپۆ |
| | طعم ـ تام |
| ض ، ظ ، ذ / ز | قرض ـ قەرز |
| | حوض ـ حەوز |
| | ظلم ـ زوڵم |
| | ظرف ـ زەرف |
| | ذخیرە ـ زەخیرە |
| | إذاعة ـ ئیزاعە |

........ هتد .

ئەم جۆرە دەستکاری کردنەی وشـــە کارێـکی گرنگ و پێویستە ، بەتایبەتی چونـکە وشـەی بێگانە وەردەگیرێ بۆ ئەوەی لەسەر وشەکانی زمانی کوردیی کاڵەکە بکرێ . بێشك ئەم دەستکاری کردنەش دەبێتە هۆی پتەو بوون و رەگ داکوتانی ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا . هەروەها هەنـــدێ جار بە جۆرێك پتەو دەبن و رەگ دادەکوتن و جێی خۆیان دەکەنەوە و جێگیر دەبن و دەچەسپێن ،

که نەك تەنیا تەنگ بە وشەی کوردیی رەسەن هەڵدەچنن ، بەڵکو جێشیان پێ لەنگ و لێژ دەکەن و خۆیان شوێنیان دەگرنەوە .

رێکەوتی وەهاش زۆرە کە وشـەیەکی عەرەبی بە جۆرێك هاتۆتە زمانی کوردییـەوە و بە شێوەیەك دەستکاریی کراوە و تواندراوەتەوە و بەرگێکی کوردیی وەهای بە بەردا کراوە کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی تەواودا هەستی پێ دەکرێ و رۆن دەبێتەوە و دەردەکەوێ ، کە ئەو وشەیە بە رەسەن کوردیی نییە ، وەك : « متمانە » ـ « مطمئن » ، « تام » ـ « طعم » ، « ئانقەست » ـ « عن قصـد » ، « کاژ ج » ـ « کل وجه » ، « عەلەتەوار » ـ « علی التوالي » . ( دە سـاڵی عەلەتەوار ـ عشر سنین علی التوالي ) ، « جینار » ـ « جیران » ( کوردەکانی یەکێتی سۆڤێت بەکاری دەهێنن ) ، « مەشخەڵ » ـ « مشعل » ، « سات » ـ « ساعة » .... وە گەلێکی تر .

وشەی تورکیی لە زمانی کوردیدا :

چۆن لە ئەنجـامی دراوسێتی و تێکەڵاویی کورد لەگەڵ فارس و عەرەب ، ژمارەیەك وشەی فارسیی و عەرەبی کەوتۆنەتە زمانی کوردییەوە ، هەر لەو رێگەیەشەوە گەلێك وشەی تورکیی هاتۆنەتە زمانی کوردییـەوە ، وەك : « قەرەباڵغ » ، « قاتر » ، « چوخم » ، « یاپراخ » ( یاپراق ـ بە تورکیی واتە ـ گەڵا ) ، « دۆڵمە » ... هتد .

## رەگی (عنصر)ی بێگانە لە موفرەداتی زمانی کوردیدا :

رێگای سەرەکی زۆر بوون و دەوڵەمەند بوونی زمانی کوردی لە گەل قۆناخەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنیدا ، بێ شك داڕشتن و داتاشین و دروست کردن و هەڵێنجانی وشەی نوێیە لەو گەنجینەیەی هەبوە . ئەم ڕوداوە ـ واتە داتاشین و پەیدابوونی وشەی نوێ ـ لە زمانی کوردیدا ، وەك ئاشکرایە بە هۆی ئەو دەستور و یاسایانەی دێتە ئەنجام کە لە خاسیەت و تایبەتێتی وشە داڕشتنی زمانەکەماندا هەن .

لەگەڵ ئەوەشدا ڕاست نەدەبو ئەگەر لە زۆربوون و دەوڵەمەندبوونی موفرەداتی زمانی کوردیدا سەرچاوەی بێگانە پشت گوێ بخرێ و زمانەکەمان بە وشەی زمانانی دیکە موتوربە نەکرێ ، ئەگەر چی ئەو زمانانە لە پێکهاتن و بنجدا لە کوردییەوە دوور بن .

لەم وەرگرتنەشدا پێویستە جیاوازی لە نێوان وشەی بێگانە و زڕەزێو (کلمه مقتبسة بالقیاس Calque)[١٩] بکەین :

### ١ـ وشەی بێگانە .

هەرچەندە لە زمانی کوردیدا وشەی بێگانە زۆرە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیسبەتێکی کەمی تێکڕای موفرەداتی زمانەکەیە . بەشێك لەو وشە بێگانانە ناوی ئەو شت و دیاردە و ...ن کە لای کورد

(١٩) Translation loan - word

نەبوون و لەگەڵ هاتنیان ، ناوەکانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە ، وەك (حەج ، رادیۆ ، تەلەفزیۆن ، هەبا .. هتد) . بەشێکی دیکەیان ئەو وشە بێگانانەن کە بۆ هەمان مانا بەرامبەریان وشەی کوردیی رەسەن هەبوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر هاتونەتە زمانی کوردییەوە ، وەك (فەقیر ، ئەرز ، فکر ، عیلاج ـ ... هتد) .

زۆر وشەی بێگانە روَن و ئاشکرا دیارن و بە ئاسانی هەستیان پێ دەکرێ و بنجیان دەدۆزرێتەوە ، بەڵام وەك لەسەرەوە باسمان کرد ، هەندێ وشەی بێگانەی وەهاش هەن بە پێچەوانەوە تەنیا لە رێگای تۆژینەوەی تایبەتی و زمانەوانییەوە دەتوانرێ شی بکرێنەوە و دەربخرێن . بەم جۆرە ئەو جۆرە وشانە کە رەنگی بێگانەیان بە باشی پێوە دیار نییە ، هۆی دەگەڕێتەوە بۆ کاتی وەرگرتنیان و سنووری بەکار هێنانیان .

لەو رایەدام ، کە پێویست نا کا بە بێ هۆ وشەی بێگانە بەکار بهێنرێ ـ واتە کاتێك بۆ دەربڕینی مەبەستێك وشەی کوردیی جوان و لەبار و بەکارهێنراو و ئاشکرا هەبێت ، ئیتر بۆ پەنا بۆ وشەی بێگانە ببرێت ـ بۆچی بڵێین « دەماغ ، فەقەرە ... » لە کاتێکدا کە خۆمان « مێشك ، بڕبڕە ... »مان هەیە و چییان لە « دەماغ و فەقەرە ... » کەمترە . جگە لەوە پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین ، کە بەکارهێنانی وشەی بێگانە ، بە تایبەتی لە شوێنی پێویستی خۆیدا کارێکی راست و رەوانە و هەر وەك وشەی کوردیی رەسەن جێی خۆی دەگرێ .

## ٢ ـ زرەزێۆ ( كلمة مقتبسة بالقياس Calque ) .

لە موفرەداتی زمانی كوردیدا زرەزێۆ بەرچاو دەكەون ، كە لە رێگای داتاشین و ماناوە وەرگیراون .

وا رێ دەكەوێ وشەیەكی بێگانە لە رووی مۆرفۆلۆژییەوە لە چەند بەش پێكهاتبێ و چۆن دروست بووبێ و مانا و واتای چی بێ ، لە وەرگرتن و وەرگێڕاندا بۆ سەر زمانی كوردی پێكهاتن و دروست بوون و مانا و واتای رەچـاو كراوە . لە رووی دروست بوونی مۆرفۆلۆژییەوە لە زمانە بێگانەكەدا چۆن بووە لە زمانی كوردیشـدا هەر بەو جۆرە داتاشـراوە . هەروەهـا لە رووی لێكسیكۆلۆژیشەوە مانای چی بووە ، هەر بەو شێوەیە واتای بەخشیوە . بە وێنـە وشەی « proanoun »ی ئینگلیزی ، كە لە « pro ـ جێ ، لە جێی ، لە باتی . . » و « noun ـ ناو » پێكهاتوە بە « راناو ، جێناو ... » كە لە « را » و « ناو » ، « جێ » و « نـاو »... پێكهاتوون دازێژراون . هەروەها وشـەی « شرق شـناس ، خاوەرشناس »ی فارسی ، كە لە « شرق ، خاوەر » ـ « رۆژهەڵات » و « شناس » ـ « ناس » پێكهاتوە كە كراوە بە « رۆژهەڵاتناس » .

بـەم جۆرە دەبینین ، ئـەو زرەزێژانە كە لە زمانی بێگانەوە وەرگیراون و وەرگێڕاون لە كەرەستەی كوردی دروست كراون ، بەڵام شێوەی پێكهاتنیان تیشك دانەوەی وشەی بێگانەن .

## موفرەداتی زمانی کوردی لە ڕوی چالاکی و سستییەوە :

وەك ئاشکرایە ، پێشکەوتن و گەشەکردنی زمان و دەوڵەمەند بوون و کۆبوونەوە و دروست بوونی ، بەستراوە بە پەیدا بوون و سەرهەڵدانی وشەی نوێوە . زمانی هەر میللەتێکیش پێویستی بە دروست بوون و پەیدابوونی وشەی نوێی هەیە ، کە ئەویش پەیوەندی بە گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی بەرهەم و کولتور و زانست .... ەوە هەیە .

بەڵام پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئەو گۆڕانە تەنیا نابێ بە هۆ بۆ پەیدابوون و دروست بوونی وشەی نوێی ، کە زۆر لەو زمانەدا نەبوون ، بەڵکو لە هەمان کاتدا لە موفرەداتی زماندا دیاردەیەکی پێچەوانە ڕوو دەدات ـ ئەو دیاردەیەش ئەوەیە کە هەندێ وشە لەکار دەکەون و پەکیان دەکەوێ و بەرەو سوان و کۆن بوون دەچن ، بۆ نمونە : ناوی ئەو وشانەی پەیوەندییان بە ئاشی ئاوەوە هەیە ، یاخود ئەو وشانەی لە پەیوەندی خێزانیدا بەکار دێن ... ، وەك ( هەوێ ، هێوەرژن ، دش ، هەنەزا .... ) . بەداخەوە هەست دەکرێت ئەو وشانەی کە ناومان بردن هەندێ ڕستۆك جێگایان دەگرنەوە ، وەك لە جێگای « دش » ـ « خوشکی مێرد » ... هتد .

بەم چەشنە وشەی نوێ لە زماندا بنج دادەکوتێ و جێی خۆی دەکاتەوە ، وە وشەی کەم بەکار هێنراو زمان بەجێ دەهێڵێ ـ ئەمەش دیاردەیەکی هەمیشەیی و دوور و درێژە .

بەگشتی لە موفرەداتی زماندا، لەیەك كاتدا دوو چین وشە هەن :
یەك ـ چالاك ، دوو ـ سست :

وشەی چالاك ئەوانەن كە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەكار دەهێنرێن و هەردەم لەسەر زارن و لە چاپەمەنیەكاندا بەرچاو دەكەون . وشەی سستیش ئەو وشانەن كە كەم بەكار دەهێنرێن[٢٠] ـ ئەویش ئەو وشانەن كە زمان هێشتا پێویستی پێیان نەبووە، یاخود پێویستی پێیان نەماوە . بەم جۆرە وشەی سست بریتییە لە :

١ ـ ئەو وشانەی لەكار دەكەون و بەسەكیان دەكەوێ و كۆن دەبن و بەرەو سوان دەڕۆن ـ واتە وشەی مردە (الكلمات الميتة ـ Obsolete ) .

٢ ـ ئەو وشە نوێیانەی هێشتا بە تەواوی لە زماندا ڕەگیان دانەكوتاوە ، یاخود تازە هاتونەتە ناو زمانەوە ـ واتە وشەی نوێباو (الكلمات المولدة ـ Neologism ) .

وشەی مردە (الميتة Obsolete ) :

لەكار كەوتن و نەمانی وشە كارێكی گرانە و یەكسەر ڕوو نادات ، بەڵكو لەسەرخۆ دەبێت . دوای ئەوەی لە ڕێگای هۆی تایبەتییەوە بەكار هێنانی هەندێ وشە كەم دەبنەوە و لە بەشی چالاكەوە دەچنە

(٢٠) بێگومان دەبێ وشەی سست لەگەڵ ئەو وشانەدا كە خاوەن پیشەی تایبەتی لە كاری ڕۆژانەیاندا بەكاری دەهێنن جیا بكرێنەوە .

بەشی سستەوە ، ئنجا دوایی وردە وردە کەمتر بەکار دەهینرێن و تا یەکجاری لەسەر زار دەکەون و زمان بەجێ دەهێڵن .

لەنێوان وشەی مردەشدا جیاوازی هەیە . هەندێ لەو وشانە بە جۆرێك لەکار کەوتوون و هێندە لە مێژە لەسەر زمان نەماون ، کە بەرەی ئەم دەمەی کورد نەیبیستوون و تەنیا لە رێگای توژینەوەوە ئاشکرا دەبن . ئەم جۆرە وشانەش بریتین لە :

أ ـ ئەو وشانەی بە تەواوی لە زمان چوونەتە دەرەوە و بە هیچ جۆرێك لە زمانەکەماندا بەدی ناکرێن و تەنانەت لە پێکهێنانی وشەی لێکدراویشدا ئەسەریان نییە .

بۆ ئەم مەبەستە لەو تێکستانەدا کە ئۆسکارمان کۆی کردوونەتەوە(٢١) ، گەلێك نموونە بەرچاو دەکەون ، وەك : « نسرین » ،

---

Oskar Mann. Die Mundart der Mukri- Kurden, Teil. (٢١) I. Berlin, Druck und Verlag, 1906.

ئۆسکارمان زانای مەزنی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٠١دا بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبی کوردی هاتوەتە کوردستانی ئێران و دوو ساڵ و نیو لە ساباڵاغ و دێیەکانی موکریاندا ماوەتەوە و زۆر شتی بە نرخی کوردی نوسیوەتەوە . بەشێکی لە نوسراوەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٠٠دا بە خەتێکی لاتینی تایبەتی چاپ کردوە و بە پێشکەش ناردویە بۆ شای ئێران ( مظفر الدین شاه )ی قاجار و بۆیە ناوی ناوە ( تحفهء مظفریة ) . بەشی کوردی ئەم کتێبە کە ٣٠٢ لاپەرەی ٣٥ دێڕییە بریتییە لە شەش چیرۆك و هەژدە بەیت و چەند گۆرانی . =

« کەبڕێن » ، « سەبڕێن » ... هتد ، کە لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا نەماون و ماناشیان تەنیا لە ڕێگەی ڕستەوە ئاشکرا دەبن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان تەنانەت بە ڕستەش ڕوون نابنەوە .

لەو تێکستانەدا دەبینین ، کە وشەی « نسرین » بە مانای « پەژارە ، خەم ، داخ ... » هاتوە ، ئەویش لە ڕستەدا بۆمان دەردەکەوێ :

ئەگەر ژنی گەورەی میری وا دەبینێ
بانگ دەکا : برایم چاکە ، مەکێشە خەم و نسرینێ[22]

هەرچی وشەی « کەبڕێن »و « سەبڕێن »ە مانایان ئاشکرا نییە و تەنانەت لە ڕستەشدا بۆمان ڕوون نەبۆتەوە :

---

= کۆڕی زانیاری کورد ، ئەرکی هێنانەوە سەر ڕێنوسی کوردیی و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی ئەم تێکستانەی خستە ئەستۆی مامۆستا هێمن ـ ئەندامی یاریدەری کۆڕ کە خۆی موکریانییە و ئەو شێوە کوردییە باش دەزانێ و لە فۆلکلۆری ئەدەبی کوردیدا ئەزموون و شارەزایی هەیە . ئەویش گەلێکی خۆ پێوە ماندوو کردوە و بە پوختی هێناویەتیە سەر ڕێنوسی کوردیی و پێشەکییەکی نایابی بۆ نوسیوە . ئەوە چەند مانگێکە ئەم کتێبە بەنرخە کە لە باری زمان و ئەدەب و فەرهەنگی کوردییەوە زۆر دەوڵەمەند و بایەخدارە کەوتۆتە دەست خوێنەرانی بەڕێز و هیوادارین کەڵکی لێ وەربگیرێ . ئێمە بۆ چەند شوێنێکی ئەم نوسینەمان سوودمان لەو کتێبە وەرگرتوە و ئەوی ڕاستی بێ هەندێ کێشەی ئەم لێکۆڵینەوەیەمانی ئاسان کرد .

(٢٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٨٥ ..

دەڵێ : خولایە نە بە کەبڕێنی ، نە بە سەبڕێنی
بۆ خوت گیانان دەدەی ، گێیان دەستێنی[23]

پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین کە ئەو وشانەی لەسەرەوە ناومان بردن تەنانەت لەو دەورەشدا کە ئۆسکارمان تۆماری کردون ـ واتە حەفتا ساڵێك لەمەوبەر ـ هەر وشەی مردە بوون . بەڵگەشمان بۆ ئەمە ، ئەوەیە کە ئەو وشانە تەنیا لە شیعرەکاندا هەن و لە پەخشانەکاندا نین . ئەوەش ئاشکرایە کە شیعر وەك خۆی دەمێنێتەوە و مەودای دەستکاری کەمە و پتر لە پەخشان دەپارێزرێ .

ب) ئەو وشانەی بەشێك لە رێژەکانیان لە زماندا نەماون . بە وێنە وشەی « پەروەردە » ـ وەك : ناوی بەرکار ماوە ، بەڵام رێژەکانی تری نەماون . کەچی ئەگەر تەماشای زمانی فارسی بکەین ، دەبینین کە رێژەکانی دیکەی ئەم وشەیە ، وەك « پرۆریدن ، میپروراند ، پرورش ، ... » ماون .

یاخود هەر لەو تێکستانەدا کە ئۆسکارمان تۆماری کردوون ، وشەی « بوێر »[24] ـ بە مانای « ئازا » بەرچاو دەکەوێ ، بەڵام لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ئەم وشەیە نەماوە ، کەچی رێژەکانی دیکەی ، وەك « ناوێرێ ، پێم ناوێرێ ، پێوێران ، پێی وێرام ... » نەك

(٢٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٢٩ .
(٢٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢١١ .

هەر ماون ، بەڵکو زۆریش بەکار دەهێنرێن .

وشەی نوێباو (الـكلمات للولدة Neologism ) .

بەرامبەر بە دیاردەی نەمانی وشە و چوونە دەرەوەیان لە زمان ، دیاردەی پەیدابوونی وشەی نوێی هەیە ، کە ئەمیش وەك لە سەرەوە باسمان کرد هۆیەکی گرنگە بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی هەر زمانێك .

ئەم دیاردەیە - واتە پەیدابوونی وشەی نوێ لە زماندا - لە هەر دەورێکی مێژوودا بێت ، دەبێتە هۆی پەیدابوونی چینێکی دیکە لە وشەی سست .

وشەی نوێباو - ئەو وشـانەن کە وا بۆ مانایەکی ناسراوی دانەیەك ( وحدة ) لە زمان بەکار دەهێنرێن و تازە هاتوونەتە زمانەوە و هێشتا نەچوونەتە ریزی وشەی چالاکی ئەو زمانەوە .

ئەو جۆرە وشانە ، تا ئەو دەمەی بە تەواوی رەگ دادەکوتن و جێگیر نەبن و بڵاو نەبنەوە و نەچنە ریزی وشەی چالاکەوە ، هەر بە نوێباوی دەمێننەوە و رەنگی تازەییان تێدا دەبینرێ . بە وێنە وشـەی « رێزمان » - هەرچەندە ماوەی ( ٢٠ ) سـاڵێك دەبێت لە زمانی کوردیدا پەیدابووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە تـەواوی بڵاوبۆتەوە و جێگیربوە و رەگی داکوتاوە و رەنگ و بۆی نوێباوی پێوە نەماوە ، هاتۆتە ریزی وشەی چالاکی کوردییەوە .

هـەروەها « تویـەر » ، « خوێنـەر » ، « گۆڤار » ،

« چیرۆك » .... وەک گەلێکی تر . لەگەڵ ئەوەدا کە لە مێژ نییە لە زمانی کوردیدا هاتوونەتە ناوەوە ، بەڵام چونکە تێکڕای خەڵکەکە وەری گرتوون ، لەبەر ئەوە لە نوێباوی دەرچوون و لە ڕیزی وشەی چالاکی کوردیدا وەستاون .

بەم جۆرە ، وەك لە سەرەوە وتمان ، وەنەبێ هەموو وشەیەکی نوێ ـ واتە هەر وشەیەك کە تازە لە زماندا پەیدا بووبێ ـ دەبێ نوێباو بێ . وشەی نوێ بە نوێباو دەژمێردرێت تا ئەو کاتەی ڕەنگ و بۆی تازەیی پێوە بێ و بە تەواوی جێگیر نەبووبێ و نەکەوتبێتە سەر زاری بەشی زۆری هەڵگری ئەو زمانە . بە وێنە ، ئەو زاراوانەی لەم ساڵانەی دواییدا لە زمانی کوردیدا پەیدابوون ، بەشێکیان بە تەواوی چەسپاون . بەڵام بەشێکی تریان هێشتا بە باشی جێگیر نەبوون و بە تەواوی بڵاونەبوونەتەوە ، ئەمیش ئەگەر چی هۆی ئەوە بێ کە ئەو وشانە زاراوی ئەو زانستانە بن کە تەنیا بۆ پسپۆڕی ئەو کارە بێت و پەیوەندی بە تێکڕای خەڵکەکەوە نەبێ ؛ یاخود هۆی ئەوە بێ کە شێوەی دانان و داڕشتنیان لەبار نەبێ و نەچنە دڵی خەڵکەکەوە ... ئەم دوو هۆیە بن یاخود هۆی بەجێی دیکە ، باری کارەکە ناگۆڕن و گرنگ ئەوەیە کە بە هەر جۆرێك بێت ، ئەو وشانە هێشتا بە تەواوی جێی خۆیان لە زمانی کوردیدا نەکردۆتەوە و بۆن و بەرامەی نوێباوییان لێ دێت .

هەرچی وشەی نوێباوە پەیدا دەبێ لە ئەنجامی :

١ ـ هاتنەکایەی شت و مانا و دیاردەی نوێی .

٢ ـ سەرهەڵدانی ناوی نوێی بۆ ئەو مانایانەی کە ناویان هەبوە .

بێگومان پەیدابوونی وشەی نوێی لە رێگای یەکەمەوە ، بۆ زمان کارێکی پێویستە ، چونکە ناکرێت ئەو شت و مانا و دیاردە نوێیانە بێ ناو بمێننەوە چونکە میللەت و زمان پێویستیان بە بەکارهێنانیان هەیە .

پەیدابوونی وشەی نوێی لە رێگای دووەمەوە ، هەرچەندە وەك رێگای یەکەم پێویست و گرنگ نییە ، بەڵام هۆیەکی گرنگە لە پێشخستن و گەشەپێدانی زماندا . پەیدا بوونی وشەی نوێی بۆ ئەو مانایانەی کە ناویان هەبوە لە ئەنجامی هەست کردنی خاوەنی ئەو زمانەوەیە بۆ هێنانەکایەی وشەی نوێی .

• • • •

# فریزیۆلۆژی

( الكناية ـ العبارات الاصطلاحية PHRASEOLOGY )

رسته کە لە ئاخاوتنی ئێمە پێکهاتوە ، بەسەر وشەدا دابەش دەبێ . کەم ڕێ دەکەوێ رستە لە یەك وشـە دروست ببێ . پتر لە پێکهاتنی رستەدا چەند وشەیەك بەشداری دەکەن : ( ئازاد چوّ بۆ بازاڕ ) ؛ ( ئەمڕۆ یەکەم رۆژی هاوینە ) ؛ ( زمانی کوردی زمانێکی هیند و ئەوروپاییە )... لە رۆی سینتاکس ( Syntaxe )ەوە رستە یەکسەر بە سەر وشەدا دابەش نابێ ، بەڵکو لە نێوانی رستە و وشەدا زنجیرێکی سینتاکسی هەیە ـ ئەویش فرێزە ( عبارة Phrase ) .

فرێز ـ بەو دانە سادە سینتاکسییە دەڵێن ، کە لە دوو یاخود چەند وشەیەکی سەربەخۆ[1] پێکهاتبێ و رێزمان بە یەکەوەی بەستبێ .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆرە فرێز هەیە :

---

(١) بێگومان پێویستە لە چەند وشەیەکی سەربەخۆ ( واتە لە چەند وشەیەکی تەواو ) پێکهاتبێ لەبەر ئەوەی پیتی بانگێشتن و پیتی پەیوەندی )... وشەی ناتەواون ناتوانن فرێز دروست بکەن . بە وێنە لە رستەی « من دەچم بۆ بازاڕ »دا ، ناتوانین بڵێین کە « بۆ بازاڕ » فرێزە ، چونکە ( بۆ ) وشەی تەواو نییە . ( بۆ جیاوازی کردن لە نێوان وشەی تەواو و ناتەواودا ، بڕوانە : ( ل ٧ ـ ٩ ی ئەم کتێبە ) .

١ـ فرێزی بەرەڵڵا .

٢ـ فرێزی گیراو .

فرێزی بەرەڵڵا ئەوەیە ، کە بە ئاسانی و بە پێی پێویست دابڕێوڕێ ، یاخود لە رستە دەربهێنرێ ، بەوێنە : لە رستەی « تۆ دیمەنی بەهار و جەژنی نەورۆزت دیوە »دا دەتوانرێ دوو فرێزی بەرەڵڵا : « دیمەنی بەهار » ، « جەژنی نەورۆز » وەربگیرێ .

هەرچی فرێزی گیراوە پێی دەوترێ « فرێزیۆلۆژی ، ئیدیۆم » . کاتێ لە یەککگرتنی هەندێ وشەدا واتای تایبەتی پەیدا دەبێ ، ئەوە بەو جۆرە فرێزانە دەڵێن فرێزیۆلۆژی .

لە زمانی کوردیدا ـ وەك هەر زمانێکی دیکەی سەر ئەم زەمینە ـ جگە لە وشەی جودا جودا ، کە دانەی زمانن ، هەروەها پێکهاتی ئاڵۆزتر هەیە کە پێی دەوترێ فرێزیۆلۆژی ، وەك : « دەستەئەژنۆ » ، « پشت ئەستوری » ، « روو رەشی » ، « روو زەردی » ، « برین کولانەوە » ، « شوولی لێ هەڵبڕین » ، « کای کۆن بەبا کردن » .... هتد .

چونکە فرێزیۆلۆژی لە سیستێمی زماندا بە مانای دیکە دێت ، لەبەر ئەوە پێویستە لە روونکردنەوە و ئاشکرا کردنی خاسیەت و دەوریدا ، لە لایەکەوە جیاوازی لەگەڵ فرێزی بەرەڵڵادا ، وە لە لایەکی ترەوە لەگەڵ وشەی جودا جودادا بکرێت .

ئەو دوو رێگەیەی لێکۆڵینەوەی فرێزیۆلۆژی ، وەك دیاردەیەکی

دیارکراوی زمان شتێکی زۆر پێویست و گرنگە ، ئەویش لەبەر دوو هۆ : یەك ـ فریزیۆلۆژی لە زماندا ئەرکی خۆی لە رێگای وشەی جودا جوداوە دەبینێ ؛ دوو ـ فریزیۆلۆژی لە پێکهاتنیدا لێکدراوە و پارچەکانی وشەی سەربەخۆن . تەنیا لە تەماشاکردنی تەواو و وردبوونەوەی قوڵ لە خاسیەتی ، جیاوازی لەگەڵ فریزی بەرەڵلادا دەردەکەوێ و لە وشە نزیك دەبێتەوە . وە لە دواییدا ، واتە لە ئەنجامی بەراوردکردنیدا لەگەڵ وشەدا ، دەتوانرێ بزانرێ کە فریزیۆلۆژی چییە .

لێکۆڵینەوە لە کێشەی فریزیۆلۆژی زمانی کوردی ، نەك تەنیا کەڵك و سوودی بۆ دامەزراندنی تیۆری فریزیۆلۆژی زمانی کوردی هەیە بە تایبەتی ، بەڵکو هەروەها بۆ کاری فەرهەنگنوسی و لێکسیکۆلۆژی بە گشتیش گەلێك پێویست و بە کەڵکە .

خاسیەتی سەرەکی فریزیۆلۆژی ـ واتە فریزی گیراو ـ ئەوەیە کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ فریزی بەرەڵلادا جودایە ، وە لە هەمان کاتدا لە وشە نێزیك دەبێتەوە . فریزی بەرەڵلا لە کاتی ئاخاوتندا دروست دەبێ ، هەرچی فرزیۆلۆژییە لە کاتی ئاخاوتندا دروست نابێ ، بەڵکو دانەی پێکەڵ و ئامادەی زمانە . بە وێنە لە کاتی ئاخاوتندا کە دەوترێ : « کامەران هێندەی رست ، سەرم ئاوسا » ، ئەوە لەم رستەیەدا « سەرم ئاوسا » ، کە فریزیۆلۆژی (فریزی گیراو)ە وەنەبێ لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا دروست بوبێ ، بەڵکو لە شێوەیەکی ئامادە و پێکەڵدا لە زماندا هەبووە و بەر لەم کاتە داڕێژراوە .

پێویست بە بیری خاوەنی رستەکەیدا هێناوەتەوە و ئەویش وەك
کەرەستەیەکی ئامادە هەستی خۆی پێ دەربڕیوە ... هەرچی فریزی
بەرەڵڵایە لە کاتی ئاخاوتندا لە وشەی جودا دادەڕێژرێ . بە نموونە :
کە دەوترێ : « منیش پاش چەند ساڵێك تووشی لاوێکی رۆناکبیر
هاتم » ، ئەوە لەم رستەیەدا « لاوێکی رۆناکبیر » ، کە فریزی
بەرەڵڵایە لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا لە وشەی جودا دروست بووە .

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێش : بۆچی کێشەی فریزی گیراو لە
بەشی لێکسیکۆلۆژیدا تەماشا دەکرێت ؟ ... ئاشکرایە ، کە فریز
پارچەیەکە لە رستە ـ واتە مەفهومی سینتاکسییە و ئەمە راستە و بەم
بۆیە دەبێ فریز لە بەشی سینتاکسدا لێی بکۆڵرێتەوە . بەڵام
کێشەی فریزی گیراو ( فریزیۆلۆژی ) لە سنووری سینتاکس دەردەچێ و
لە لێکسیکۆلۆژی نزیك دەبێتەوە . زۆر جار دەبینین ، کە بە مانا و
واتا وەك یەك وشەیە ، بە وێنە فریزی گیراوی : « ئەسپێ لە
گیرفانیدا سەوزەڵە خانم دەڵێ » ـ بە مانا و واتای وشەی « لات ،
هەژار » دێت . یاخود فریزیۆلۆژی : « نانی لەسەر ساج سوتاوە » ـ
بەرامبەر بە وشەی « پەلەکەر » دەوەستێ .... هتد .

لە زمانی کوردیدا فریز هەن ، کە هەمیشە بەرەڵڵان ، وەك :
« کچی جوان » ، « نامە نووسین » ، « چا خواردنەوە » ،
« پیاوی ئازا » ، « کتێب خوێندنەوە » .... هتد . فریزیش
هەن ، کە هەردەم گیراون ، وەك : « کوڵۆڵەی کەوتە لێژی » ،
« لووت تێ ژەنین » ، « دایە کێو » ، « بە ئاگر یاری کردن » ....
هتد .

هەروەها زۆر فرێز هەن ، کە دەکرێ بەرەڵلاش و گیراویش بن ، ئەمەش پەیوەندێ بە مانا و مەبەست و بەکارهێنانیانەوە هەیە و لە رستەدا دەردەکەوێ . بە وێنە فرێزی : « شتوڵی لێ هەڵبژی » ـ مانا راستەوخۆکەی ئەوە دەگەیەنێ کە « یەکێك شتوڵ لە یەکێك هەڵبژێ » . بەم پێیە ، ئەمە فرێزێکی بەرەڵلایە . بەلام بە مانای تیانی ـ واتە « لە تای دەرکرد ؛ لە رادەی تێ پەڕاند » ـ دەبێ بە فرێزێکی گیراو ( فرێزیۆلۆژێ ) . یاخود فرێزی : « دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا » ـ مانا راستەوخۆکەی ئەوە نیشان دەدا ، کە « یەکێك دۆ بهێنێ و لەگەڵ دۆشاودا تێکەڵی بکا » ـ ئەمە فرێزێکی بەرەڵلایە . هەرچی مانای تیانی ئەم فرێزەیە بۆ ئەوە دەوترێ ، کە « یەکێك لە وتووێژێکدا ، یاخود لە کارێکدا .... تورە دەبێ و قسەی نابەجێ دەکا و لە رادەی تێ دەپەڕێنێ » ـ بەم مانایە فرێزێکی گیراو دروست دەبێ . فرێزی « ئاشی ناگەڕێ » ، ئەگەر وەك فرێزێکی بەرەڵلا بەکار بهێنرێ ، ئەوە واتاکەی ئەوە دەردەخا کە « ئاشەکەی ئیش ناکات » . بەلام کە ببێ بە فرێزێکی گیراو ( فرێزیۆلۆژێ ) ، ئەوە مانای « کاری وەستاوە » دەگەیەنێ ـ واتە مەرج نییە ، ئەو کارەی ئیشی ئاش بێت ، بەڵکو هەر ئیشێك بێت جیاوازێ نییە .

فرێزی گیراو ( فرێزیۆلۆژێ ) هەموو وەك یەك نین ، بەڵکو لە رادەی یەکگرتن و پەیوەندێ ئەو وشانەی پێکیدەهێنن ، وە لە رۆی ئەوەی کە مانای گشتێ فرێزەکە بە هەر وشەیەکی ئەو فرێزەوە تا چ رادەیەك پەیوەستە جیاوازێ هەیە جا لەم رێگەیەوە ، لە زمانی

کوردیدا دەتوانرێ سێ جۆر فرێزیۆلۆژی دیار بکرێن :

١ـ فرێزیۆلۆژی تێکچژاو Phraseological concretion

٢ـ فرێزیۆلۆژی یەکگرتو Phraseological unity

٣ـ فرێزیۆلۆژی تێکئالاو Phraseological collocation

فرێزیۆلۆژی تێکچژاو :

مانای گشتی فرێزی بەرەللا سەراپا بەندە بە مانای ئەو وشانەوە کە فرێزەکەیان دروست کردوە . هەر وشەیەك مانای سەربەخۆی خۆی هەیە ، وە مانای تەواوی فرێز بریتییە لە سەرپاکی مانای تێکڕای وشەکانی . بە نمونە مانای گشتی فرێزی « چەقۆ تیژ کردنەوە » ، سەراپا بەندە بە مانای وشەکانیەوە : « چەقۆ » و « تیژ کردنەوە » .

لە نێو فرێزی گیراودا ، بەر لە هەمو شتێك دەتوانین فرێزی تێکچژاو دەست نیشان بکەین . ئەم جۆرە فرێزانەش ، ئەوانەن کە مانای گشتییان بە هیچ جۆرێك بەند نییە بە مانای ئەو وشانەوە کە فرێزەکەیان پێکهێناوە . لەم ڕووەوە فرێزی تێکچژاو ، بەرامبەر بە فرێزی بەرەللا ڕاستەوخۆ دژ دەوەستێ .

کاتێك ، بەشێك لە فرێزێك بریتی بێ لە وشەیەك کە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆی نەبێ ، ئەوەوە پەیوەندی لە نێوان مانای وشەکان و تێکڕای فرێزەکەدا نابێ . بە وێنە لە زمانی کوردیدا ، بە جودا وشەی « مول »[٢] نییە ، لەبەر ئەوە مانای فرێزی « گول و

(٢) دیارە کە « مول » لە « گول »ەوە هاتوە و ئەم جۆرە دیاردەیە لە زمانی کوردیدا زۆرە . هەرچەندە « مول » بە تەنیا مانای نییە ،=

موڵ » ناتوانرێ لە سەرپاکی مانای هەردوو وشەکە وەربگیرێ ، چونکە بەشێك لەو فرێزە ـ واتە یەکێك لەو دوو وشەیە ـ واتای نییە . بەڵام تێکڕای فرێزەکە واتای ئاشکرایە . وشەی « مت » لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی سەربەخۆ نییە ، بۆیەکا مانای فرێزی « شت و مت » ناتوانرێ لە سەرپاکی مانای هەردوو وشەکە وەربگیرێ ، چونکە بەشێك لەو فرێزە ـ واتە وشەی « مت » ـ واتای نییە . بەڵام تێکڕای فرێزەکە واتای ئاشکرایە ... هتد .

هەر لەبەر ئەو هۆیە ـ (واتە چونکە لە هەندێ فرێزدا وشەی وا رێدەکەوێ کە بە تەنیا مانای نییە) ـ دەتوانرێ ئەو فرێزانەی خوارەوە لە خانەی فرێزیۆلۆژی تێکچڕاوادا دابنرێن ، وەك :

هاتەران پاتەران ـ « هاتەران » بە مانای (وڕێنە) دێت ، بەڵام « پاتەران » بە تەنیا مانای نییە .

گێـژ و وێژ ـ « گێژ » بە مانای (بێهۆش) دێت ، بەڵام « وێژ » بە تەنیا مانای نییە .

قسە و مسە ... وە گەلێکی تر .

هەروەها لە زمانی کوردیدا فرێزی وا هەن ، کە وشەی مردە

---

= بەڵام بەشێکە لە فرێزی « گوڵ و موڵ » و هێز و پێزی بە فرێزەکە داوە و بە بێ ئەو وشەی « گوڵ » بە تەنیا نابێ بە فرێزیۆلۆژی ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مانای فرێزەکە لە رێی وشەی « گوڵ »ەوە دەردەکەوێ .

(الكلمه الميتة Obsolete)[٣]یان تێدایە . لە زانستی زماندا ، ئەو جۆرە فرێزانەش هەر بە فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاو دەژمێردرێن ، چونکە مانای گشتی فرێزەکە ، ناتوانرێ لە رێگای سەرپاکی مانای وشەکانەوە وەربگیرێ . ئەویش لەبەر ئەوەی مانای بەشێکی فرێزەکە (کە وشەی مردەیە) ئاشکرا نییە ... بەشەکەی تری رۆن کردنەوەی مانای فرێزەکەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی . جا کە مانای فرێزێك لە رێگای بەشێکییەوە وەربگیرێ ، ئەوە مەودای ئەوەمان دەدات ، کە ئەو جۆرە فرێزانە بە فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاو بدەینە قەڵەم .

فرێزیۆلۆژی یەککرتو :

فرێزیۆلۆژی یەککرتو ئەوەیە کە مانای لە رێگای مانای سەرپاکی ئەو وشانەوە (پارچانەوە) پێکیان هێناوە ئاشکرا دەبێ . بە وێنە فرێزی «زمان درێژ» ، کە بە مانای «زۆر بلێ» دێت ، لە «زمان» و «درێژ» پێکهاتوە . لێرەدا هەردوو وشەکە واتادارن . بەم چەشنە مانای فرێزی «زمان درێژ» لە سەرپاکی وشەی «زمان» و «درێژ»ەوە پەیدا دەبێ . یاخود فرێزی «کلك و گوێ کردن»[٤] کە فرێزیۆلۆژی یەککرتووە ، گشت پارچەکانی مانایان هەیە و سەرپاکی ماناکانی ئەو وشانە (پارچانە) مانای تەواوی فرێزەکە دەدەن بە دەستەوە .

جا جیاوازی نێوان فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاو و فرێزیۆلۆژی

---

(٣) بڕوانە : ل ٤٩ ـ ٥٣ ی ئەم کتێبە ، کە دەربارەی وشەی مردەیە .
(٤) بە مانای « ئەتك کردن » هاتووە .

یەکگرتو ئەوەیە ، کە یەکەمیان ـ واتە فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاو ـ واتاکەی بەند نییە بە واتای تێکڕای ئەو پارچانەوە ( وشـــانەوە ) دروستیان کردوە ، بەڵکو واتای لە ڕێگای بەشێکییەوە ئاشکرا دەبێ . دووەمیـــان ـ واتە فرێزیۆلۆژی یەکگرتو ـ واتاکەی لە ڕێگای سەرپاکی ئەو وشانەوە پێکیان هێناوە دەردەکەوێ و وشەی بێ واتای تێدا نییە .

لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری ئەو وشانەی فرێزیۆلۆژی زمانی کوردییان پێکهێناوە ، وشەی واتادارن ، بۆیەکا دەتوانین ڕێگا بـە خـۆمان بدەین ، کە زوربەی فرێــزیۆلۆژی زمانی کوردی لە خانەی فرێزیۆلۆژی یەکگرتودا دابنێین . بەڵگەشمان بۆ ئەوە ، ئەو نمونانەی خوارەوەن : « ناوی بە گەروی ئاشا چێ » ، « ناوی بە قوڕا چێ » ، « دەستی داری گرتوە » ، « دەستە ئەژنۆ » ، « چنـگ لەسەر شان » ، « پشت ئەستوری » ، « زمان لێدەرهێنان » ، « چوارپێ » ، « مل لە چەقۆ سوین » ، « دوکەڵ لە ماڵی هەڵناستێ » ، « داری بەسەر بەردیەوە نەماوە » ، « تەنـگ بە تاریکە شەوەوە نان » ، « دایە کێو » ، « کای کۆن بە با کردن » ، « کوڵۆڵەی کەوتە ئێژێ » ، « نـــاوی خۆی نازانێ بنوسێ » ، « کەوڵەکۆن » ، « لوت تێ ژەنـین » ، « متۆی سەری ڕەپ بێ » ... وە گەلێـکی تر .

فرێزیۆلۆژی تێکئالاو :

فرێزیۆلۆژی تێکئالاو ئەو جۆرە فرێزانەن کە یەکێک لە وشەکانی بەندە و لە بەکار هێناندا گیراوە و تەنیا لە فرێزێـکدا بەکار دەهێنرێ ،

کچی لەگەڵ ئەوەشدا مانای سەربەخۆی خۆی هەیە . بە وێنە ، ئەگەر فرێزی « خۆ لە تەل دان » وەربگرین ، ئەوە دەبینین کە تێکڕای پارچەکانی ئەم فرێزە واتادارن ، بەڵام « لە تەل دان » تەنیا لەم فرێزەدا بەکار دەهێنرێ(٥) .

لە فرێزیۆلۆژی تێکئاڵاودا تەنیا پارچەیەکی فرێزەکە گیراوە ، لەگینا پارچەکەی دیکەی بەرەڵایە و دەتوانێ بە هەمان واتا لەگەڵ وشەی تردا یەك بگرن ، وەك : « خـۆ کەڕ کردن » ، « خـۆ گێل کردن » ......هتد .

جیاوازی فرێزیۆلۆژی تێکئاڵاو لەگەڵ فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاودا ، ئەوەیە کە یەکەمیان - واتە فرێزیۆلۆژی تێکئاڵاو - لـەو پارچەیەی گیراوە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆیەتی . بەڵام دووەمیان - واتـە فرێزیۆلۆژی تێکچڕژاو - ئەو پارچەیەی کە گیراوە مانای سەربەخۆی خۆی نییە .

## فرێزیۆلۆژی لە ڕوی واتـاوە :

لە ڕوی واتـــاوە ، لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جوور فرێزیۆلۆژی دەست نیشان بکرێن :

١- فرێزیۆلۆژی یەك واتا :

ئەو فرێزیۆلۆژییانەن کە یەك مانایان هەیە ، وەك : « مل لە چەقۆ سـوون » - واتە « خۆ هاویشـتنە مەترســییەوە » ، « برین

(٥) هەرچەند « لە تەلدان » لە فرێزی تریشدا بەر چاو دەکەوێ ، بەڵام مەودای بەکار هێنانی زۆر نەسکە .

کولانەوە» واتە «خەم ، بەبیرهاتنەوە» ... وە گەلێکی تر .

٢ـ فرێزیۆلۆژی فرەواتا :

ئەو فرێزیۆلۆژییانەن کە پتر لە مانایـــەك دەبەخشن ، وەك : «دوکەڵ لە ماڵی هەڵناسێ» ـ بە واتـای «هەژاری» و «رژدی (رەزیلی)» دێت ... هتد .

لێرەدا ، پێویســتە پەنجە بۆ ئـەوە رابکــێشین ، کە لە زمانی کوردیدا فرێزیۆلۆژی فرەواتا لە فرێزیۆلۆژی یەك واتا زۆر کەمترە .

فرێزیۆلۆژی و هەندێ دیاردەی تری زمان :

هەندێ لە زانایانی زمان ، پەندی پێشینان و قســەی نەستەقیش هەر بە فرێزیۆلۆژی دەدەنە قەڵەم . بەڵام پێویســـتە ئەوە لە یاد نەکەین ، کە «پیاو بە تەمای دراوسێ بێ ، بێ شێو سەر ئەنێتەوە» ؛ «بە زمانی شیرین مار لە کون دێتە دەر» ؛ «مریشك خۆی خۆڵ نەکا بەسەر خۆیا ، کەس ناتوانێ خۆڵی بەســـەرا بکا» ؛ «گا لە کڵاوڕۆژنەوە ســـەر ئەخا» ؛ «کەر بێ کورتان نابێ» ؛ «رۆژ بە پەنجە ئەژمێرێ» ؛ «راســـت بە و بە لای شێردا بڕۆ» ؛ «خەو برای مەرگە» ؛ «مردن هەر جارێــکە» .... هتد لەگەڵ فرێزیۆلۆژیدا جیاوازییان هەیە . ئەو جیاوازییەش ، بە زۆری لە رووی بەخشینی مانا و پێکهاتنی رێزمانییەوەیە .

بێگومان پێویســتە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین ، کە دەتوانرێ هەندێ لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق (بە تایبەتی قسەی نەستەق) لە ریزی فرێزیۆلۆژیدا دابنرێن . ئەویش بە تایبەتی ئەوانەی خاوەنەکانیان

دیارن و لە سنووری پێکهاتنی فرێز دەرنەچوون .

## لێکۆڵینەوە لە فرێزیۆلۆژی زمانی کوردی :

لێکۆڵینەوەی فرێزیۆلۆژی زمانی کوردی باسێکی نوێیە و تاکو ئێستا شتێکی ئەوتۆ دەربارەی نەنوسراوە . ئەوەی بڵاوکراوەتەوە و من ئاگادرم ، تەنیا وتارێکی (یو. یو. ئاڤالیانی)[٦] و کتێبێکی (مەکسیمی خەمۆ)[٧] یەکە بە رووسی نوسراون. (یو.یو. ئاڤالیانی) لە وتارێکی چوار لاپەڕەییدا لە مەسەلەی جودا کردنەوەی کاری لێکدراو (الفعل المرکب Compound Verb) و فرێزیۆلۆژی دواوە[٨] و شتێکی زۆر کەمی فرێزیۆلۆژی زمانی کوردی باس کردوە. هەرچەندە (مەکسیمی خەمۆ)ش لە کتێبەکەیدا[٩] لە تێکڕای کێشەی فرێزیۆلۆژی زمانی کوردی نەکۆڵیوەتەوە، بەڵام هەندێ لایەنی گرنگی ئەو باسەی شی کردۆتەوە .

---

(٦) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بەم کوردناسە و بە کارە زانستییەکانی ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسراوە ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٨ .

(٧) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٩ .

(٨) یو. یو. ئاڤالیانی ، مەسەلەی جودا کردنەوەی کاری لێکدراو و فرێزیۆلۆژی کار (لەسەر کەرەستەی زمانی کوردی) ـ « کورتەی هەواڵەکانی کۆنفرانسی زمانناسی » ، سەمەرقەند ، ١٩٥٨ ، ل ٤٠ ـ ٤٣ (بە زمانی رووسی) .

(٩) م. خەمۆ (خامۆیان) ، دەربارەی فرێزیۆلۆژی ناو لە زمانی کوردیدا ، یەریڤان ، ١٩٧١ (بە زمانی رووسی) .

جگە لەو چەند لێکۆڵینەوەیە، لێرەدا بە پێویستی دەزانم، پەنجە بۆ ئەوە رابکێشم، کە مامۆستایان : تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ ... لە فەرهەنگەکانیاندا هەندێ نمونەی فرێزی گیراو (فرێزیۆلۆژی)یان تۆمار کردوە . هەروەها مامۆستا صادق بەهائەدین ئامێدی لە ساڵی ١٩٧٣دا لە بەغدا کتێبێکی گەورەی بە ناوی « ئیدیەمێت کوردی »یەوە بڵاوکردەوە[١٠] . ئەم نوسراوە بریتییە لە فەرهەنگێکی فرێزیۆلۆژی کوردی - هەرەبی . بێ گومان، ئەمە کارێکی گرنگ و پێویستە و یەکەم هەنگاوی دانانی فەرهەنگی فرێزیۆلۆژی کوردییە . ئەوەی کەم و کورتی هەرە گەورەی ئەم نوســراوە بێت، ئەوەیە کە هەندێ وشە و فرێزی بەرەڵڵا بە فرێزی گیراو (فرێزیۆلۆژی) دانراون و تۆمار کراون . بۆیە، لە زمانی کوردیدا نەبونی لێکۆڵینەوە لەم روەوە بوەتە هۆی ئاڵۆزی و نائاشکرایی گەلێک کێشەی زمانەکەمان .

لێکۆڵینەوەی قوڵ و تەواو لە فرێزیۆلۆژی زمانی کوردی، مەودای ساغکردنەوەی گەلێک کێشەی گرنگ و ئاڵۆزی وشـــە ئاسان دەکات .

ئەرکی ســــەرەکی فرێزیۆلۆژی لە سەرێکەوە ناســـینی لێکۆڵینەوەی سیستێمی زمانە لە ئێستا و رابوردویدا، لە پەیوەستییدا لەگەڵ وشە و دروست بونیدا . لە سەرێکی دیکەوە رونکردنەوە و دەرخستنی پەیوەندییەتی لەگەڵ رێزماندا .

* * * *

(١٠) صادق بهاءالدين ئامێدی، ئیدیەمێت کوردی، بەغدا، ١٩٧٣ .

# فەرهەنگ نوسی

فەرهەنگ ـ ئەو کتێبەیە ، کە وا وشەی تێدا تۆمار کراوە . جگە لە ریز کردنی وشە ، هەروەها لێی کۆڵراوەتەوە و مانای رۆن کراوەتەوە و لێکدراوەتەوە و شیکراوەتەوە و زانیاری دەربارەی چۆنێتی نوسینیان و بە دەما هاتنیان و پەیدابونیان ... دراوە .

هەرچەندە فەرهەنگ جۆری زۆرە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ دو جۆری سەرەکی جیا بکرێتەوە : یەك ـ فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی ، دو ـ فەرهەنگی فیلۆلۆژی . فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی سەبارەت بە رۆداو و دیاردە و خەڵك ... هتد دەدوێ . هەرچی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە لە وشە دەکۆڵێتەوە ، واتە وشە کە دانەی زمانە کەرەستەی سەرەکی فەرهەنگی فیلۆلۆژیە .

لە فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیدا خاسیەتی رێزمانی وشە و لیقاندانی چۆنێتی بەکارهێنانی و پەیدابونی و دروست بونی و چۆنێتی دەوری لە رستەدا ... بەر چاو ناکەوێ ، بەڵکو کاری سەرەکی لە لێکدانەوەی وشەدا ، رۆنکردنەوەی ئەو دیاردەیە یە کە وشەکەی لێوە هاتوە . بەڵام لە فەرهەنگی فیلۆلۆژیدا بە شێوەیەکی سەرەکی ،

گرنگی بە وشەکە خۆی دەدرێ و مانای لێکدەدرێتەوە و حاڵەتی ڕێزمانی دەنوسرێ و سەرچاوەی پەیدابوونی ئیشان دەدرێ و چلۆنیێتی بەکارهێنانی بەدیار دەخرێ .

فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی جۆر جۆرە ، وەك : ئینسکلۆپیدی گەورە ، ئینسکلۆپیدی بچووك ، ئینسکلۆپیدی پزیشکی ، ئینسکلۆپیدی تەکنیکی ... هتد .

فەرهەنگی فیلۆلۆژی بە گوێرەی مەبەست و شێوەی لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی کەرەستەی زمان ، دەتوانرێ بەسەر چەند جلۆرێکدا دابەش بکرێ :

ئەو فەرهەنگانەی بە کەرەستەی زمانی زگماك ، مانای وشەی زمانێکی بێگانە لێکدەدەنەوە ، یاخود بە پێچەوانەوە ـ واتە بە کەرەستەی زمانێکی بێگانە ، مانای زمانی زگماك لێکدەدەنەوە . ئەم جلۆرە فەرهەنگانە ، چۆن بۆیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بن ـ واتە دوو زمان بن ، هەروەها بۆشیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ چەند زمانێکی دیکە بن ـ واتە فرەزمان بن .

ئەم جلۆرە فەرهەنگانە ( بە وێنە : فەرهەنگی کوردی ـ عەرەبی ؛ فەرهەنگی عەرەبی ـ کوردی ؛ فەرهەنگی کوردی ـ ئنگلیزی ؛ فەرهەنگی ئنگلیزی کوردی ؛ فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ؛ فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ؛ فەرهەنگی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی .... هتد ) تا ڕادەیەك لە کاری فەرهەنگنووسی کوردیدا گرنگییان پێدراوە و ژمارەیەك فەرهەنگی کوردی ـ بێگانە ،

بێگانه ـ کوردیی نووسراوه .

لەتەك ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها فەرهەنگ هەن کە وشەی زمانێك بە کەرەستەی هەمان زمان لێكدەدەنەوە . ئەم فەرهەنگانەش چەشنی جیاوازیان هەیە ... بەداخەوە لە کاری فەرهەنگ نووسیی کوردیدا ، گرنگی بەم جۆرە فەرهەنگانە کەم دراوە[1] .

## کاری فەرهەنگنووسیی کوردیی

ـ ۱ ـ

### لە سەرەتاوە تا شەڕی یەکەمی جیهان

دەمێکە دەست بە کاری فەرهەنگ نووسیی کوردیی کراوە و دانەری یەکەم فەرهەنگی کوردی کورد بووە . لە ساڵی ۱۰۹٤ ی ك ـ ۱٦۸۲/۱٦۸۳ی زدا شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانیی لە ژێر ناوی (نەوبەهار)دا فەرهەنگۆکێکی بە شیعر بۆ یارمەتیدانی منداڵانی کورد لە فێربوونی زمانی عەرەبیدا نووسیوە و لە سەرەتادا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە :

نە ژ بو صاحب رواجان
بلکی ژ بوچوکی د کرمانجان

ئەم فەرهەنگە چەند جارێك لە چاپ دراوە :

---

(۱) لەو باسەدا کە لێرەوە دەستی پێ دەکەین ـ واتە لە باسی ئەو فەرهەنگانەدا ، کە هەر لە زووەوە تا ئەمڕۆ لە مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا دانراون ، ئەو راستییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە .

یەك ـ لە پاشکۆی فەرهەنگەکەی یوسف ضیاءالدین پاشای خالدی[٢] و
دوو ـ لە کتێبەکەی (لی کۆك)ی زانای ئەڵمانیدا[٣]...

یەکەم فەرهەنگی کوردی کە لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە نوسرابێ ئەو فەرهەنگە ئیتالیایی ـ کوردییەیە کە قەشەی ئیتالیایی (ماوریزۆ گارزۆنی Maurizio Garzoni ) لە ساڵی ١٧٨٧ دا لە رۆما لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا کە لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسیویێتی بڵاوی کردۆتەوە[٤] . ئەم فەرهەنگە دەور و بەری پێنج هەزار وشەی ئیتالیاییە کە مانا کانیان بە شێوەی کوردی ئامێدی لێك دراوەتەوە و لە چۆنێتی شەرح و روونکردنەوە و دانی مانای وشەدا بە نیسبەت ئەو دەمەوە زۆر سەرکەوتووە و تەنانەت لەگەڵ ئەوەشدا کە نزیکەی (٢٠٠) ساڵێك بەسەر لە چاپدانیدا تێپەڕیوە ، هێشتا سوود و کەڵکی هەر بەردەوامە .

لە ساڵی ١٢١٠ی ك ـ ١٧٩٥ی ز دا شیخ مارفی نۆدێی لە ژێر ناوی (احمدی)دا بە شیعر فەرهەنگۆکێکی عەرەبی ـ کوردی داناوە . ئەم فەرهەنگۆکە هەر لە ساڵی ١٩٣٦دا دوو جار لە چاپ دراوە : یەك ـ لە سلێمانی[٥] ، دوو ـ لە بەغدا[٦] . پاش ئەوەش

---

(٢) یوسف ضیاءالدین پاشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیة فی اللغة الكردیة ، استانبول ، ١٣١٠ ھ ـ ١٨٩٣ م .

(٣) Le Coq, Kurdische Texte, Berlin, 1903 ; T. I. II.

(٤) Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della lingua Kurda, Roma, 1787.

(٥) شێخ مارفی نۆدێی ، احمدی ، سلیمانی ، ١٩٣٦ .

(٦) شێخ مارفی نۆدێی ، احمدی ، بەغدا ، ١٩٣٦ .

گەلێ جاری تر لەچاپ دراوەتەوە .

لە پاش نوسینی ئەو چەند کارەی لە سەرەوە ناومان بردن تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لەم ڕووەوە هیچ شتێکی وەها نەنوسراوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە هەبێت تەنها ئەو دوو سەد وشەیەیە کە لە لایەن ریچ[٧] و ئەو ٢٧٣ یەیە لە « فەرهەنگی بەراوردێ هەموو زمان و شێوەکان »دا تۆمارکراوە[٨] .

لە سەرەتای نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەدا لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردێ بە گشتێ و نوسینی فەرهەنگ بە تایبەتێ کەوتە ڕەو . لە سالآنی ١٨٥٦ و ١٨٥٧ و ١٨٥٨ دا ڕۆژهەلآتناسی بە ناوبانگ ، زانای گەورەی ڕوس - پیۆتر لێرخ سێ کتێبی لە بارەی کورد و کوردستانەوە بلآوکردەوە[٩]. کە تا ئەمڕۆش لە کتێبخانەی کوردناسیدا

(٧) C. J. Rich, Narrative of a residence in Koordistan and on the site of ancient Niniveh, ...... London, 1836 - 1837, pp. 394 - 398.

(٨) П.С. Палас. Сравнительные словари всех языков и наречий, СПб., 1787, ч. I, № 77

( پ س. پالاس ، فەرهەنگی بەراوردێ هەموو زمان و شێوەکان ، پیترسبورگ ، ١٧٨٧ ) .

(٩) П. Лерх. Исследования об иранских курдах и их предках северных халдеях, СПб., 1856, 1857, 1858

( پ. لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێران و خالدییەکانی=

هاوتایان کەمە و بە سەرچاوەیەکی ڕەسەن دەژمێررێن . لە کتێبی سێیەمیـــدا فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی ژوورو) ـ ڕوسی (ل ١ ـ ٨٤) ، وە کوردی (زازا) ـ ڕوسی (ل ٨٥ ـ ١٠٨) لە چاپ داوە .

ئا. ژابا جگە لەو خزمەتەی کە لە تۆمار کردنی فۆلکلۆر و لێکۆڵینەوەی کورد و زمانەکەیدا کردویەتی ، لە نوسینی فەرهەنگی کوردیدا کارێکی گەورە و خزمەتێکی بێشوماری کردوە . ئەم زانایە خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ فەرەنسی یە کە لە پاش خۆی بە فەرمانی ئەکادیمیەی ڕوسی لە ساڵی ١٨٧٩ دا فێردیناند یوسنی بڵاوی کردەوە[١٠] . ئەم فەرهەنگە بریتیە لە (٤٦٣) لاپەڕە و (١٥) هەزار وشەی کوردی کە جگە لە لێکدانەوە و شەرح کردنیان لە داڕشتن و دروست بون و پەیدابونیان کۆڵیوەتەوە و هەروەها لەگەڵ وشەکانی فارسی و عەرەبی و تورکیدا بەراوردی کردوون .

ئا. ژابا هەروەها دوو فەرهەنگی تریشی داناوە : فەرەنسی ـ ڕوسی ـ کوردی ، وە کوردی ـ فەرەنسی ـ ڕوسی کە هێشتا بە دەستنوسی ، ماونەتەوە و لە ئارشیفی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت لە لێنینگراد هەڵگیراون .

س. ری ـ میسیۆنێر (مبشر)ی ئەمەریکایی ماوەیەکی درێژ لە

= سەرۆی باو باپیرانیانەوە ، پیترسبورگ ، بەشی یەکەم ١٨٥٦ ، بەشی دوەم ١٨٥٧ ، بەشی سێیەم ١٨٥٨ .

(١٠) A. Jaba, Dictionnaire kurde - francais, St-Petersbourg, 1879.

ناوچەی هەکاری زیاوە و ساڵی ۱۸۷۰ کورتەیەکی ڕێزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە[۱۱] لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا فەرهەنگۆکێکی بیست لاپەڕەیی کوردی - ئینگلیزی نوسیوە

نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدە ڕۆژهەڵاتناس - ئا. سۆتسین کتێبێکی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[۱۲] کە بەشی سێیەی پێتییە لە فەرهەنگۆکێکی کوردی - ئەڵەمانی (ل ۲۸۱ - ۳٤۱).

لە کتێبەکەی س. ئا. یەگیزارۆفدا کە لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە نوسیویتی[۱۳]، چاومان بە دوو فەرهەنگۆك دەکەوێ :

---

(۱۱) S. A. Rhea, Brief] Grammar and vocabulary of the Kurdish Language of the Hakari district in « Journal of the American Oriental Society », New Haven, 1872. Vol X.

(۱۲) E. Prym and A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt I. II, S. Pbg, 1887 - 1890.

(۱۳) С.А. Егизаров. Краткий этнографический очерк курдов Эриванской губернии, "Записки Кавказского отдела императорского Русского географического общества", книжка XIII, выпуск 2, Тифлис, 1891

س. ئا. یەگیزارۆف ، مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی پارێزگای یەریڤان ، « هەواڵەکانی لقی قەفقاسیای کۆمەڵی جوگرافیایی ڕوسی ئیمپراتۆری » ، تفلیس ۱۸۹۱ .

یەك ـ کوردی ـ رۆسی (ل ١ ـ ٦٥) ؛ دوو ـ رۆسی ـ کوردی (ل ٦٦ ـ ١٢٢) . یەکەم دەوری سێ هەزار ، دووەم ـ چوار هەزار وشەیەکی تیایە .

ساڵی ١٨٩٣ یوسف ضیائەددین پاشای خالدی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی لە ئەستەمبوڵ لە چاپ دا[١٤] . ئەم فەرهەنگە ، کە (٣١٩) لاپەڕەیە ، لە سامانی فەرهەنگ نوسی کوردیدا کارێکی بە نرخە ...[١٥]

مێجەر سۆن لە پاشکۆی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩١٣دا لە لەندەن بڵاوی کردۆتەوە[١٦] ، فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ـ کوردی (ل ١٧٠ ـ ٢٨٩) داناوە . هەروەها لەو کتێبەشدا کە لە ساڵی ١٩١٩دا لە بەغدا لە چاپ دراوە[١٧] ، فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ـ کوردی حەفتا لاپەڕەیی نوسیوە .

ساڵی (١٩١٦)ش ف. نیکیتین فەرهەنگۆکێکی رۆسی ـ

---

(١٤) سەرچاوەی ناوبراو ، یوسف ضیاءالدين باشا الخالدي المقدسي ، الهدية الحميدية في اللغة الكردية ، استنبول ، ١٣١٠ هـ ـ ١٨٩٣ م .

(١٥) بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر لە بارەی ئەم فەرهەنگەوە ، بڕوانە : مامۆستا نەجمەددین مەلا ، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢١ ـ ٢٥ .

(١٦) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(١٧) E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, 1919.

کوردی له ورمێ بڵاوکردەوە[18] و دوای ئەوە بە سێ ساڵ کتێبی ڕێزمانی میسیۆنێری ئەمەریکایی ل. و. فۆســـۆم دەرچو[19] ، کە فەرهەنگۆکێـکی شازدە لاپەڕەیی لەگەڵدا بڵاوکردۆتەوە (ل ٢٦٢ ـ ٢٧٨).

ـ ٢ ـ

## پاش شەڕی یەکەی جیهان

### له کوردستان :

له ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیســتەمدا دەورێـکی نوێی له مێژوی فەرهەنـگنوسی کوردیدا دەست پێدەکات و ئەمەش یەکێك بو له ئەنجامەکانی قوڵ بونەوەی هەســتی نەتەوایەتی کە یەکێك له بەرهەمە ڕۆشنبیرییە گرنگەکانی ڕێتی بو له بایەخ پێدانی خوێندەوارانی کورد خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژوی گەلەکەیان . کاری فەرهەنـگنوسی تا ساڵانی پەنجا له چوارچێوەیەکی ســت و سادە و ساکاردا مایەوە و ئەوانەی لەو ماوەیەدا بڵاوکراونەتەوە و شایانی باسن ڕێتین له : یەکەم ـ لیستەی ئەو زاراوە کۆمەڵایـەتی و سیاسیانەی جەلادەت عالی بەدرخان له ســالانی سیدا له بەشێکی تایبەتی گۆڤاری

---

(18) В. Никитин. Краткий русско-курдский военный переводчик, Урмия, 1916

( ف. نیکیتین ، فەرهەنگی جەنـگی ڕوسی ـ کوردی ، ورمێ ، ١٩١٦

(19) L. O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minneapolis, 1919.

« هـــاوار »دا لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆك »دا بڵاوی کردۆتـەوە ؛ دووهەم ـ ئەو زاراوانەی مامۆســـتا عەلادین سەجادی لە گۆڤاری « نزار »دا بڵاوی کردۆتەوە ؛ ســێیەم ـ فەرهەنگۆکەکەی مامۆستا شاکر فەتاح کە ســـاڵی ١٩٣٤ لە چاپی‌داوە [٢٠] ؛ چوارەم ـ ئەو فەرهەنگە عەرەبی ـ کوردییەی ، شاعیری کورد مامۆستا عەبدوڵڵا زێوەر ساڵی ١٩٤١ داینا‌وە[٢١] ....

لە ماوەی ئەم بیست ســـاڵەی دواییشدا هەندێ مامۆســـتای دڵسۆز لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنـگاوی گەورەیان ناوە و ژمارەیەك فەرهەنگی بایەخداریان بڵاوکردۆتەوە و کاری فەرهەنگ نوسی کوردی پێشکەوتوە و پەرەی سەندوە و گەشەی کردووە .

مامۆستا گیو موکریانی دەورێکی گەورە و بەرزی لە مێژوی فەرهەنگ‌نوسی کوردیدا بینیوە و دەها ســـاڵ لە ژیانی لاوی و پیری بەو کارەوە بردۆتە سەر و لە ئەنجامدا چەند فەرهەنگێکی داناوە :

« رابەر » ـ فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عەرەبی و کوردییە ، لە

---

(٢٠) شاکر فتاح ، فەرهەنگۆك ، ئینگلیزی ـ کوردی و کوردی ـ ئینگلیزییە ، رەواندوز ١٩٣٤ .

(٢١) ئەم فەرهەنگە کە تەرجەمەی فەرهەنگی « اختری »یە ، وەك دانەر نوسیویێتی لە بیست و پێنجی مانگی تەموزی ١٩٤١ دا تەواو بوە . بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا لە چاپ نەدراوە و بە دەستنوسی ماوەتەوە . ئەم دەستنوسە کە دو دەفتەری گەورەیە لە کتێبخانەی « کۆڕی زانیاری کورد »دا پارێزراوە .

ساڵی ۱۹۵۰دا لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر دەرچووە[۲۲] . ئەم فەرهەنگە نزیکەی (۱٥) هەزار وشـــەی عەرەبییە ، کە ماناکانیان بە کوردی لێدراوەتەوە . لە کردنەوەی مانای وشە ، لە وەرگێڕانی وشە عەرەبییەکاندا بۆ کوردی ، لە شەرح کردنی ئەو وشە عەرەبیانەی لە کوردیدا بەرامبەریان نییە بە تێکڕایی سەرکەوتوە . هەرچەندە پتر لە ۲۰ ســـاڵ بە سەر دەرچوونی ئەم فەرهەنگەدا تێپەڕ بوە ، بەڵام تاکو ئێستا سوود و کەڵــکی هەر بەردەوامە .

لە ســاڵی ۱۹٥٥یشدا فەرهەنگێــکی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی لــە ژێر ناوی « کۆڵکەزێڕینە »دا بڵاوکردەوە[۲۳] . وشەکانی ئەم فەرهەنگە بەسەر (٥۹) باسی بچوکدا دابەش کراون و لە هەر باسێکدا زوربەی ئەو وشانە بەرچاو دەکەون کە پەیوەندییان بەو باســـەوە هەیە . هەرچەنـــدە لەم فەرهەنگەدا ناتەواوی و کەم و کورتی هەیە ، بەڵام دەتوانرێ بەشی زۆری ئەو ناتەواوییانە بخرێتە ئەستۆی دواکەوتنی زانـتی فەرهەنـــگ نوسی کوردی لەو سەردەمەدا .

مامۆســـتا گیوموکریانی لە ســـاڵی ۱۹٦٦ دا چاپی دووەمی « کۆڵـکەزێڕینە »ی دەرکرد[۲٤] . چاپی دووەم بریتییە لە هەڵبژێری و

(۲۲) گیو موکریانی ـ « ڕابەر » ، فەرهەنگێـکی قوتابخـانەیی عارەبی و کوردییە ، هەولێر ، ۱۹٥۰ .

(۲۳) گیو موکریانی ـ « کۆڵـکەزێڕینە » ، کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـ ئنگلیزی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ۱۹٥٥ .

(۲٤) گیو موکریانی ـ « کۆڵـکەزێڕینە » ، کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـ ئنگلیزی ، چاپی دوەم ، هەولێر ۱۹٦٦ .

پترکردن و هەروەها لەگەڵ چاپی یەکەمیدا گەلێك جیاوازی هەیە و زۆر لەو کەم و کورتییانەی لە چاپی یەکەمدا هەبوون چارکردوە.

ساڵی ١٩٦١یش فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی لەژێر ناوی فەرهەنگی « مەهاباد »دا بڵاوکردەوە[٢٥]. ئەم فەرهەنگە چ لە بارەی زۆری وشەوە و چ لە بارەی شێوە و شێواز و جۆری دانانیەوە، گەلێك باشترە و کەم و کورتی کەمترە وەك لەوانەی پێشوی. ژمارەی وشە کوردییەکانی ئەم فەرهەنگە نزیکەی (٣٠) هەزار وشەیە ـ واتە دوو ئەوەندەی فەرهەنگی « رابەر »ە. لە جـــۆری ریزکردن و رێکخستنی وشەکاندا و لە چۆنێتی لێکدانەوە و یەکالاکردنەوە و دانی مانای وشەدا لەسەر رێگایەکی نوێی و راست و جوان رۆیشتوە.

جگە لەو فەرهەنگانەی باسمان کردن، مامۆســتا گیو موکریانی فەرهەنگی « کوردستان »یشی داناوە. ئەم فەرهەنگە کە کوردی ـ کوردییە هێشتا لە چاپ نەدراوە[٢٦].

ساڵی ١٩٥٥ مامۆستا عیززەددین مەلا مستەفا « فەرهەنگۆك بۆ قوتابییانی کورد »ی بڵاوکردەوە[٢٧]. ناوەرۆك و مەبەستی ئەم بەرهەمە،

---

(٢٥) گیو موکریانی ـ « مەهاباد »، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردی و عەرەبییە، هەولێر، ١٩٦١.

(٢٦) بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر لە بارەی فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو موکریانییەوە، بڕوانە: ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چالاکی مامۆستا گیو موکریانی لە مێژوی فەرهەنگ نوسینی کوردیدا، رۆژنامەی « هاوکاری »، ژ ١٠٠ ـ ١٠٤، بەغدا، ١٩٧٢.

(٢٧) عیززەددین مەلا مستەفا، فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد، بەغدا، ١٩٥٥.

وەك دانەر خۆی لەسەر بەرگ و لە پێشەکییەکیدا بەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، لێکدانەوەی مانای وشە عەرەبییەکانی کتێبی خوێندنەوەی عەرەبی پۆلی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی و ئاسـان کردنی کار و پاشەکەوت کردنی کاتی قوتابییانی کوردە لە تێگەیشتنی ئەو وشانەدا ، کە لە پاشکۆی کتێبەکانیاندا تۆمار کراون .

شـێخ محەمەدی مەردۆخ کە زانایەکی بە ناوبانگ و ناسـراوی کوردە ، لە مەیدانی دانانی فەرهەنگی کوردیدا هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە فەرهەنگێکی « کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی » لە ساڵی ١٩٥٦دا لە تاران لە چاپ داوە[٢٨] . ئەم کارە بەراستی کۆششێکی گەورە و نوسـراوێکی بەنرخ و نایابە و کەلێنێکی گەورەی لە کاری فەرهەنگ نوسی کوردیدا پڕکردۆتەوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند کەم و کورتییەکی تێدا دەبینرێ ، وەك ئەوەی کە هەندێ وشەی دروست کراو کەوتوەتە ناو فەرهەنگەکەوە کە لە زمانی کوردیدا نین و لە گەڵ دەستوری زمانی کوردیدا ناگونجێن ، یاخود ژمارەیەك وشەی عەرەبی و فارسی وەهای تۆمار کردوە کە کورد بەکاریان ناهێنن . لە لێکدانەوە و شەرحی وشەشدا ناتەواوی و ئاڵۆزی دەبینرێ . ناتەواوی هەرە گەورەی ئەم فەرهەنگە ئەوەتە کە بە دەسـت نوسراوەتەوەو بە زەنکۆگراف لەچـاپدراوە . نوسینەوەکەشی بەشێوەیەکی فارسی شکستەیە . ئەوەش بوە بە هۆی ئەوە کوردی عێراق کە فارسی نازانن لە سنورێکی تەسکدا نەبێ

(٢٨) شێخ محەمەدی مەردۆخ ، فەرهەنگی « مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦ .

کەڵکی لێ وەرنەگرن ... بەڵام هێشتا ئەم کەم و کورتییانە ئەو کارە بە نرخە بێبایەخ ناکەن .

تاوەکو ساڵی ١٩٦٠ فەرهەنگێکی کوردی - کوردیمان نەبوو . هەست و چالاکی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ئەم کەلەبەرەیان بۆ پڕ کردینەوە . ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦٠ - ١٩٦٤دا بەرگی یەکەم و دووەمی فەرهەنگی « خاڵ » دەرچوو[٢٩] ، کە تا کۆتایی پیتی (ق) دەگرێتەوە . مامۆستا خاڵ پاشماوەکەشی خستوەتە ژێر چاپەوە .

فەرهەنگی « خاڵ » یەکێکە لە فەرهەنگە سەرکەوتوەکانی کوردی و بەرهەمێکی بەنرخ و بایەخدارە و بەگشتی لەسەر شێوەیەکی جوان و راست دانراوە و کەڵێك لەو گرانی و ناتەواوییانەی کە لە فەرهەنگەکانی پێش ئەودا هەبوون ئەم ئاسانی کردوون و پڕی کردونەتەوە .

بۆ لێکدانەوە و کردنەوەی مانای وشە توسەر چەند رێگایەکی راست و زانستی گرتوە . بۆ ئەو وشانەی کە بتوانرێ بە یەك وشە مانایان نیشان بدرێ نیشانی داوە . ئەو وشانەش کە پێویستیان بە شەرح بووبێت شەرحی کردوون . لە زۆر شوێنیشدا بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتن لە مانای وشە و بۆ فێربوونی بەکار هێنانی وشە ، وەك نمونە رستەی ئاسان و رێك و پێکی هێناوەتەوە ...

هەرچەندە چەند ناتەواوی و کەم و کورتییەکی کەم لە « فەرهەنگی

(٢٩) شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی « خاڵ » ، ب ١ - ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ - ١٩٦٤ .

خاڵ »دا هەیە ، بەڵام ئەو ناتەواوییانە بە جۆرێك نین لە نرخی فەرهەنگەکە کەم بکەنەوە . بە گشتی فەرهەنگی « خاڵ » فەرهەنگێکی سەرکەوتوە و کارێکی گرنگ و پێویستە ، بەرهەمی رەنجی چەند ساڵەی مامۆستا خاڵە لە نواندنی هونەرێکی بەرز لە دانانی یەکەم فەرهەنگدا لە کوردییەوە بۆ کوردی[٣٠] .

ساڵی ١٩٦٢ مامۆستا عەلائەددین سەجادی فەرهەنگێکی « کوردی - عەرەبی - فارسی » بلاوکردەوە[٣١] مامۆستا لەم نوسراوەدا جگە لە پێشەکی کە بە هەر سێ زمانی - واتە کوردی عەرەبی و فارسی نوسیویتی ، بە تایبەتی لە کەم و کورتی و چەڵەمەی ئیملای کوردی دواوە ، هەروەها لە (١٥) لاپەڕەیەکدا لە سەر رێزمانی کوردی نوسیوە و لە چەند شتێکی پێویست و سەرەتایی بۆ فێربونی زمان و بەکار هێنانی فەرهەنگ کۆڵیوەتەوە .

نوسەر وشەکانی ئەم فەرهەنگەی بەسەر (١٧) باسی فراواندا دابەش کردوە و ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لە هەر باسێکدا زوربەی ئەو

---

(٣٠) لە ژمارە ١٩ - ٢٢ ی ساڵی ١٩٧١ ی رۆژنامەی « هاوکاری »دا لە ژێر ناوی « فەرهەنگی خاڵ »دا ، وە لە ژمارە ١٠٠ - ١٠٨ ی ساڵی ١٩٧٢ ی هەمان رۆژنامەدا لە ژێر ناوی « چەند روونکردنەوە و بەڵگە و تێبینییەکی نوێ دەربارەی فەرهەنگی خاڵ »دا زنجیرەیەك وتارم لە بارەی فەرهەنگی ناوبراوەوە بلاوکردوەتەوە و بە دور و درێژی باسی زۆر رووی ئەو کارەم تیا کردوە .

(٣١) عەلائەددین سەجادی ، دەستور وە فەرهەنگی زمانی کوردی - عەرەبی - فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ .

وشانه بەر چاو دەکەون کە پەیوەندییان بە سەرباسەکەیانەوە هەیە و بێ‌گومان ئەمەش یەکێکە لە رووە چاکەکانی فەرهەنگەکە ... بەڵام بەداخەوە هەندێك کەم و کورتی بەر چـاو دەکەون کە بوون بـە هۆی ئاڵۆزکردن و شێواندنی هەندێ رۆی ئەو نوسراوە . بە وێنە دەبینین لە ریزکردنی وشەکاندا نارێـکی زۆرە و ئەمەش بووەتە هۆی زەحمەت کێشان لە دۆزینەوەی وشەدا . هەروەها زۆر جار لە ژێـر سەرباسەکاندا وشە دەبینرێن کە پەیوەندییان لەگەل سەرباسەکەدا نییە یاخود زۆر وشە کە پەیوەندییان هەیە و کەچی نەنوسراون . ئەمانە و چەند ناتەواوییەکی تر ، وەك دووپات‌کردنەوە لە تۆمارکردنی وشەدا و هەڵەی ئیملا ... دەبینرێن .

« فەرهەنگا کوردی » ، کە مامۆستا جگەر خوێن دایناوە ، لە ساڵی ۱۹٦۲دا بەرگی یەکەم و دوەمی لە بەغدا چاپ‌کراوە[۳۲] .

ئەم فەرهەنگە کە کوردی ـ کوردییە و بە شێوەی کرمانجی ژۆروە بێ‌شك دەوری خۆی بینیوە و دەبینێ ، بەڵام بەداخەوە لەم فەرهەنگەدا کەم و کورتی و ناتەواوی ئێجگار زۆرە . ئەگەر ئەم فەرهەنگە لەگەڵ فەرهەنگی « رابەر »ی مامۆستا گیو موکریانی ، کە لە ساڵی ۱۹٥۰دا دەرچووە ، یا لەگەڵ فەرهەنگی « خاڵ »ی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، کە بەرگی یەکەمی لە ساڵی ۱۹٦۰دا بڵاوکراوەتەوە بەراورد بکەین ، ئەوە دەبینین کە کەم و کورتی « فەرهەنگا کوردی » گەلێك زۆرترە وەك لەو دوو فەرهەنگەی لە سەرەوە ناومان بردن ،

(۳۲) جگەر خوێن ، فەرهەنـگا کوردی ، ب ۱ ـ ۲ ، بەغدا ، ۱۹٦۲ .

لە گەڵ ئەوەی فەرهەنگی مامۆستا جگەر خوێن لە پاش فەرهەنگی « رابەر » و « خاڵ » دەرچوە . لێرەدا وا دەردەکەوێ کە مامۆستا جگەر خوێن سوودی لەو فەرهەنگە کوردییانە نەبینیوە کە لە پێش فەرهەنگەکەی ئەو دەرچوون و زۆر کاری ئاڵۆزیان خاوکردۆتەوە و بەسەر گەلێك کۆسپیدا سەرکەوتون[33] .

موسا عەنتەر ساڵی ١٩٦٧ لە ئەستەمبوڵ فەرهەنگێکی کوردی ـ تورکی لە چاپ دا[34] . ئەم فەرهەنگە ، کە یەکەم فەرهەنگە لە کوردییەوە بۆ تورکی ، دەور و بەری (١٠) هەزار وشەیەك دەبێت . جگە لەوە ، دانەر لە پاشکۆی ئەم نوسراوەدا هەندێ لە دەنگەکانی زمانی کوردی دواوە .

ساڵی ١٣٤٧ی. ش. ـ ١٩٦٨ی ز لە تاران م. ئەورەنگ بەرگی یەکەی « فرهنگ کردی »ی بڵاوکردەوە[35] ، کە تەنیا پیتی (آ ـ ب) دەگرێتەوە . لەم بەرگەدا ٦٤٠٠ وشەی کوردی تومار کراوە و بە شێوەیەکی باش مانایان بە فارسی لێکدراوەتەوە . ئەم فەرهەنگە کە کوردی ـ فارسییە ، کارێکی سەرکەوتو و نایابە ... نوسەر بۆ بەجێ هێنانی ئەم ئەرکە ، سوودێکی زۆری لە کاری فەرهەنگ

---

(٣٣) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بەم فەرهەنگە ، بڕوانە : ئەو زنجیرە وتارەی کە نوسەری ئەم باسە لە ژمارە ١٣٧ ـ ١٣٨ ی ساڵی ١٩٧٢ ی رۆژنامەی « هاوکاری »دا لە ژێر ناوی « فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەر خوێن »دا بڵاوی کردوەتەوە .

Musa Anter, Ferhanga Kurdi - Tirki, Istanbul, 1967. (٣٤)

(٣٥) م. اورنگ ، فرهنگ کردی ، تهران ، ١٣٤٧ .

توســـتی کوردی ( بە تایبەتی لـــە فەرهەنگی خاڵ و مەردۆخ و « مەهاباد »ی گیو موکریانی و تۆفیق وەهبی ) وەرگرتووە[٣٦].

مامۆســـتا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیـش ، ســـاڵی ١٩٧٠ فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردی بە شیعر لە چاپ دا[٣٧] . ئەم فەرهەنگە ، کە لەسەر شێوەی فەرهەنگی « نەوبەهـــار »ی ئەحمەدی خانی و « ئەحمـەدی »ی شـێخ مارف نۆدێی داناوە ، بەرهەمێـکی بەنرخە لە کاری فەرهەنگ نوســـی کوردیدا بەنیازی مندالآن فێرە وشەی عەرەبی کردن . ئەم نوسراوە بریتییە لە (١١٢) لاپەڕە و چەند باسێـکی گرنگ و پێویست .

ســـاڵی ١٩٧١ مامۆستا عەبدولقادر بەرزنجـی « فەرهەنـگی زانیاری »[٣٨] ، ساڵی ١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ مامۆســـتا مەعروف قەرەداغی « فەرهەنگی کشت و کاڵ »[٣٩] و ســـاڵی ١٩٧٤ مامۆســـتا کەمال جەلال غەریب « فەرهەنـگی زانیاری »[٤٠] یان بڵاوکردەوە . بێگومان ئەم سێ فەرهەنـگە کارێـکی گەورە و پێویستن و جێـگای خۆیان

---

(٣٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٥ .

(٣٧) مەلا عبدالـکریمی مدرس ـ « دوڕ زشتە » ، فەرهەنـگێـکی عەرەبی و کوردییـە بە هەڵبەست ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

(٣٨) عەبدولقادر بەرزنجی ، فەرهەنـگی زانیاری ، سلێمانی ، ١٩٧١ .

(٣٩) مەعروف قەرەداغی ، فەرهەنـگی کشت و کاڵ ، ب ١ ـ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ .

(٤٠) کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنـگی زانیاری ، عەرەبی ـ کوردی ، ب ١ ـ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٤ .

لە کتێبخانەی کوردیماندا بەگشتی و سامانی فەرهەنگی نوسیماندا بە تایبەتی گرتووە و هەروەها کەلێنێکی باشیان پڕکردۆتەوە . هەرچەندە لەم سێ فەرهەنگەدا هەندێ کەم و کورتی هەیە ، بەڵام وەك تەجروبەی یەکەم لەو مەیدانەدا سەرکەوتوویی خۆیان نیشان داوە .

لەم دوو سێ ساڵەی دواییدا[41] ، مامۆستا محەمەد ئەمینی میسری سەیبدیان لە مەهاباد فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی بڵاوکردەوە[42] . ئەم فەرهەنگۆکە ، بە تایبەتی لە شێوازی رێکخستنیدا و لە چۆنیەتی لێکدانەوەی مانای وشە کوردییەکانیدا کەم و کورتی زۆر تێدایە . بەراستی ئەم بەرهەمە لەچاو کاری فەرهەنگنوسی کوردی ئەمڕۆدا ، کارێکی زۆر سادە و ساکارە .

ئەوەی پەیوەندی بە داڕشتن و دانان و دۆزینەوە و هەڵبژاردن و وەرگێڕانی زاراوەوە هەبێت ، ئەوەیە کە تا ساڵانی ٦٠ ئەم کارە بە شێوەیەکی سست و سادە و ساکار بوو ، بەڵام لە شۆڕشی چواردەی تەمموزەوە پێشکەوت و پەرەی سەند . بەرهەمی ئەم دەورە بریتییە لە : ئەو زاراوە زانستییانەی لە لایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراون و داڕێژراون و لە چەند ژمارەیەکی ساڵی ١٩٦٠ی گۆڤاری

---

(٤١) ئەم فەرهەنگۆکە دەست خەتە و زمنگۆکراف وەرگیراوە . نە ساڵی نوسینی و نە ساڵی بڵاوکردنەوەی لە هیچ شوێنێکدا تۆمار نەکراوە . بەداخەوە ، نەمانتوانی ساڵی نوسینی دەست نیشان بکەین . هەرچی ساڵی بڵاوکردنەوەیەتی ، لەو رایەداین کە ئەم دوو سێ ساڵەی دوایی بێت .

(٤٢) موحەممەد ئەمینی میسری سەیبدیان ، خود آموز سە زبان ، کردی ـ فارسی ـ عەرەبی .

« ڕۆژی نوێ »دا بڵاوکراونەتەوە. ڕاستە لە وەرگێڕان و داڕشتن و داتاشینی ئەم زاراوانەدا ناتەواوی و کەم و کوڕی ئێجگار زۆرن، وەك لە وتارەکەی مامۆستا جەمال نەبەزدا[43] کە ڕەخنەی تیا لە زاراوەکانی لیژنەی ڕیاضیات گرتوە ـ خراوەتە پێش چاو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەرهەمە دەوری خۆی بینیوە و دەبینێ. دوا بە دوای ئەم زاراوانە لە لایەن نەقابەی مامۆستایانی سلێمانییەوە فەرهەنگۆکی « زاراوەی زانستی » دەرچوو کە ٩٧ لاپەڕەیە. مامۆستا غەفور ڕەشـــید لە زاراوەکانی بەشی جوگرافیـــا کۆڵیوەتەوە و ڕەخنـــەی بەجێی لێ گرتووە[44].

لە ساڵی ١٩٦٠ دا مامۆستا جەمال نەبەز لە ژێر ناوی « هەندێك زاراوەی زانستی » دا فەرهەنگۆکێکی لە چاپ دا[45]. لە ســـاڵی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١ یشدا بە ڕۆنیۆ سەد نوسخەیەکی کتێبێکی لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆکی زانستی » دا بڵاوکردەوە[46]. یەکەم ـ نزیکەی سێ سەد، وە دووەم ـ دەور و بەری سێ هەزار زاراوەیەك یان تیایە.

---

(٤٣) جـــەمال نەبەز، زاراوەکـــانی لیژنەی ریاضیـــات لە ژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ساڵی ١٩٦٠، ژ ٦، ل ١٠٢ ـ ١٠٩ ؛ ژ ٧، ل ١١٢ ـ ١٢١ ؛ ژ ٨، ل ٨٥ ـ ٩١.

(٤٤) غەفور ڕەشید، ســـەرنجێك لە پەراوی زاراوەکانی زانسـتی کوردی، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »، ساڵی ١٩٦٠، ژ ١٢، ل ٢٧ ـ ٣٥.

(٤٥) جەمال نەبەز، هەندێك زاراوەی زانستی، سلێمانی، ١٩٦٠.

(٤٦) جەمال نەبەز، فەرهەنـگۆکی زانـستی، هەولێر، ١٩٦٠ ـ ١٩٦١.

دوای بڵاوبوونەوەی ئەو چەند بەرهەمەی لە سەرەوە ناومان بردن ، ماوەی دە ساڵێك لەم رووەوە هیچ شتێکی وەها لە چاپ نەدراوە کە شایانی باس بێت . بەڵام لە رێکەوتنە مێژوویەکەی مارتی ١٩٧٠ وە دیسان هەست بە بزووتنەوەی ئەم کارە دەکەین :

ساڵی ١٩٧١ لە لایەن لیژنەیەکی تایبەتییەوە ، کە ژمارەیەك لە زانا و کوردیزانی بە توانا هاوبەشییان تێدا کردوە فەرهەنگۆکێك کە بریتییە لە کۆمەڵێك وشە و زاراوی عەرەبی ـ کوردی لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆکی زاراوەی پارێزگای سلیمانی »دا لە چاپ درا[٤٧] . ئەم فەرهەنگۆکە نزیکەی ( ١٤٠٠ ) وشەیەك دەبێت و بۆ مەبەستی نامە نووسین لە نێوان دام و دەزگاکانی فەرمانڕەواییدا داڕاوە[٤٨] .

بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی لە ژمارە ( ٤ )ی ساڵی ١٩٧٢ ی گۆڤاری « پەروەردە و زانست » دا کە ١٩٦ لاپەڕەیە ، فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی بلاوکردۆتەوە[٤٩] . کە بریتیە لەو زاراوانەی بۆ قوتابخانەکان پێویستن . ساڵی ١٩٧٤ یش لە ژمارە ( ٧ ـ ٨ )ی هەمان گۆڤاردا ، تێکڕای ئەو زاراوانەیان کۆکردۆتەوە ،

---

(٤٧) زاراوەی پارێزگای سلێمانی ، سلێمانی ، ١٩٧١ .

(٤٨) بۆ وەرگرتنی زانیاری بتر لە بارەی ئەم فەرهەنگۆکەوە بڕوانە : ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چەند سەرنجێك دەربارەی زاراوی پارێزگای سلێمانی ، رۆژنامەی « هاوکاری » بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٦١ ـ ١٦٢ .

(٤٩) بڕوانە : گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٤ .

کە لە فەرهەنگۆکی کتێبی قوتابخانەکاندا بڵاویان کردوەتەوە[٥٠] .

کۆڕی زانیاری کورد بە شێوەیەکی زانستی و فراوان گرنگی بەم مەسەلەیە داوە و چاکی مەردایەتی بەلادا کردوە و رێبازێکی زانستی دیار کردوە بۆ ئەوەی لە سنووری توانادا بتوانێت بەرهەمێکی کامڵ بخاتە بەر دەست . تاکو ئێستا لە کۆڕی زانیاری کوردا ژمارەیەکی زۆر لە زاراوی کوردی هەڵبژێرراون و داڕێژراون و داتاشراون . ئەنجامی ئەو هەوڵ و کۆششەش ، ئەو چوار لیستەیەیە ، کە لە هەر چوار ژمارەی گۆڤاری کۆڕدا[٥١] و بە سێ کتێبی سەربەخۆ[٥٢] . بڵاوکراونەتەوە . ئەگەر کەم و کورتییەکی کەم لە کاری ئەو زاراوانەدا هەبێ ، خۆ رووە باشەکەی و پوختی و نایابییەکەی و شێوە زانستییەکەی بە جۆرێکە ، کە تا ئەمڕۆ لە کاری زاراوی کوردیدا هاوتای نییە .

---

(٥٠) بڕوانە : گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٧ – ٨ .

(٥١) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ل ٤١٩ – ٥٢٦ ؛ بەرگی دوەم ، بەشی یەکەم ، ل ٨٩٤ – ٩٤١ ؛ بەرگی دوەم ، بەشی دوەم ، ل ١٦٦ – ٢١٨ .

(٥٢) زاراوی کارگێڕی ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ ، پێشەکی و رێکخستنی د. کەمال مەزهەر ، بەغدا ١٩٧٣ – ١٩٧٤ ؛ زاراوی هەمەچەشنە ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لێژنەکانی ، پێشەکی و رێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٤ ؛ لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لێژنەکانی ، پێشەکی و رێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٥ .

جگه لەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆکانەی لە سەرەوە ناومان بردن ، لەم روەوە هەندێك كار هەن كە بە دەستەوەن . ئەوەی لە ناویاندا سەرنج رادەكێشێ و پێویستە پەنجەی بۆ رابكێشین ، فەرهەنگی یەككرتوی كوردی ـ كوردییە ، كە لیژنەی فەرهەنگی كۆڕی زانیاری كورد خەریكە دای ئەنێ . بە گوێرەی ئەو نەخشەیەی بۆی كێشراوە ، دەبێ ئەم فەرهەنگە . گەورەترین و زانستی‌ترین فەرهەنگی كوردی بێت و هەموو وشەكانی كوردی بە شێوەكانیەوە بگرێتەوە .

## لە یەكێتی سۆڤێت :

بایەخ دان بە كوردناسی لە ڕۆسیادا دوای شۆڕشی ئۆكتۆبەر ئەوەندەی تر پەرەی سەند و بوونی كەمینەیەكی كورد لەم ولاتەدا و ئەو گۆڕانە هەرە گەورەیەی بە سەر ژیانی نوێیاندا هات بوونە هۆیەكی گرنگ و نوێی گەشە كردن و پێشكەوتنی كوردناسی سۆڤێت و یەكێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەكانی ئەوەبو كە پاش ماوەیەك ڕۆڵەكانی ئەم كەمینەیە خۆشیان چاكیان لێكرد بەلادا و چالاكانە هاتنە كۆڕەوە .

پەرەسەندنی فەرهەنگ نوسی ، بێ گومان هەروەها بەستەیە بە پەرەسەندنی كوردناسی سۆڤێت خۆیەوە و لە راستیدا یەكێكە لە رووە هەرە دیار و گەشەكانی . بۆ نموونە دەبینین :

سالی ١٩٣٣ لە یەریڤان فەرهەنگێكی ئەرمەنی ـ كوردی[٥٣] ،

---

(٥٣) خەبەرناما ژ زمانێ ئەلەبی ـ كورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٣ .

وە ساڵی ١٩٣٥ فەرهەنگۆکی زاراوەی ئەرمەنی ـ کوردی[٥٤] بڵاوکرایەوە . یەکەمیان نزیکەی (٣٠٠) لاپەڕە و دووەمیان دەور و بەری (٥٠) لاپەرە دەبێ . هەر چەندە نوسەرانی ئەم دوو فەرهەنگە هەندێك وشەی کوردی وایان داڕشتوە کە لەگەڵ دەستوری زمانی کوردیدا ناگونجێن ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو فەرهەنگە دەوری خۆیان بینیوە .

ساڵی ١٩٥٧ فەرهەنگێکی نوێی ئەرمەنی ـ کوردی بڵاوکرایەوە[٥٥] . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە (٣٥٢) لاپەڕە و (٢٣) هەزار وشەیەك . هەر چەندە ئەم فەرهەنگە لە گەلێ رووەوە لەوانی پێشوو چاکتر و سەرکەوتوترە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەم و کورتی زۆرە ، بە تایبەتی لەوەی کە بەشە کوردییەکەی گەلێك وشەی روسی و ئەرمەنی وەهای تێکەوتوە کە کورد بەکاریان ناهێنن و هەروەها بە زۆر پاشگری (ی ، تی ، چی)یان لکاندوە بە هەندێك وشەوە و وشەی جوت و ناڕاستیان لێ دروست کردوە .

هەر لە هەمان ساڵدا دوو فەرهەنگی دیکە بڵاوکرانەوە ، یەك :

---

(٥٤) خەبەرناما ئێرمینۆلۆجیێ فەلەیی ـ کورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٥ .

(٥٥) سەمەندێ سیابەند ، ئارامێ چاچان ، خەبەرناما ئەرمەنی ـ کوردی ، یەریفان ، ١٩٥٧ .

رۆسی - کوردی[٥٦] ، دۆ : کوردی - رۆســی[٥٧] . فەرهەنگی یەکەم کە دوکتۆر ئی. فاریزۆف دایناوە بریتییە لە (٧٨٢) لاپەڕە و (٣٠) هەزار وشەیەك . فەرهەنگی دووەم کە دوکتۆر چەرکەزی بەکۆ (باکاییێف) دایناوە بریتییە لە (٦١٨) لاپەڕە و (١٤) هـەزار وشەیەك . هــەر یەك لەم فەرهەنـگانە کەلێنێکیان پڕکردۆتەوە و شوێنی دیاریان لە کوردناسی سۆڤێتدا وەرگرتووە .

کوردناسی بەناوبانگ و ناسراو قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) لە ساڵی ١٩٦٠دا فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی ژوورو) - رۆسی لە چاپ دا[٥٨] . کە بەرهەمی رەنجی چەند ســاڵی بو . داناني ئەم فەرهەنگە دەستکەوتێکی گەورەیە لە کاری فەرهەنگ نوســی کوردیدا و هەر لەبەر ئەوەشــە شوێنێکی بەرزی لە مێژوی فەرهەنگ نوسیاندا گرتووە .

---

(٥٦) И.О. Фаризов. Русско-курдский словарь, Москва, 1957

(ئی. ئۆ. فاریزۆف ، فەرهەنگی رۆسی - کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ) .

(٥٧) Ч.Х. Бакаев. Курдско-русский словарь, Москва, 1957

(چ. خ. باکاییێف ، فەرهەنگی کوردی - رۆسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ) .

(٥٨) К.К. Курдоев. Курдско-русский словарь, Москва, 1960

(ق. کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی - رۆسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ) .

تووسەر بۆ کۆکردنەوەی وشە هەوڵێکی زۆری داوە و گەلێک سەرچاوەی هەمەجۆرەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار هێناوە و وشـەی لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی ژوورو (و کەمێك لە کرمانجی خواروو‌ش) دەرهێناوە و بەم جۆرە توانیویەتی دەور و بەری (٣٤) هەزار وشەیەك کۆبکاتەوە کە بەشێکی زۆری وشـەکانی دیالێکتی کرمانجی ژوورو پێك دەهێنن و ئەمەش یەکێکە لە هۆی سـەرکەوتویی فەرهەنگەکە .

مامۆستا کوردۆ لە چۆنیەتی وەرگێران و لێکدانەوەی مانای وشەکانی فەرهەنگەکەیدا لە هەمان کاتدا هونەرێکی بەرزی نواندوە و بە زمانێکی رەوان و ئاسان ، بە وشـــەی بەرانبەری یا بە پێستی خۆی شەرحی وشەکانی کردوە و ماناکانی لێکداوەتەوە و هەر وشەیەك چەند مانای هەبێت هەمو ماناکانی بە رووسی نووســـیوە . بەمە و هەروەها بە هێنانەوەی گەلێك پەندی پێشینان و قســـەی نەستەق توانیویەتی دەوڵەمەندی زمانی کوردی نیشـان بدا . لە لایەکی ترەوە مامۆستا کوردۆ زوربەی وشەکانی فەرهەنگەکەی خستۆتە رســتەوە و بۆ رووسی وەری گێڕاون و لەم رێگەیەوە تێگەیشتن و بەکار هێنانی وشەکانی ئاسان کردوە ، خۆ ئەگەر وشـــەیەکی کوردی بەرانبەری لە رووسیدا نەبێ ئەوە بە شـەرحێکی کورت و ئاشـکرا مانای ئەو وشەیەی داوە بە دەستەوە .

ئەم فەرهەنگە بە یەکێـــك لە فەرهەنگە بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت و تەنانەت لی. ئی. تسوکرمان دەڵێ : « گەورەترین

نوسراوی زانستییه له کاری کوردناسی سۆڤیێتدا[٥٩] » .

نزیکەی ده ساڵێکه چه‌ند کارگێڕێکی بەشی کوردییەکەی لێنینگراد به سەرۆکایەتی قەناتی کوردۆ خەریکی دانانی فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی خواروو) ـ رووسین و ئێستا ئامادەکراوە بۆ چاپ . ئەم فەرهەنگە که نزیکەی ۳۰ هەزار وشەیەکی کوردییە و کارێکی سەرکەوتوو و نایابە و هەوڵێکی زۆری لەگەڵدا دراوە و بۆ نوسینی سوود له گەلێك سەرچاوە وەرگیراوە .

دوکتۆر مەکسیمی خەمۆ که کارگێڕی بەشی کوردییەکەی یەریڤانە چەند ساڵێکە خەریکی دانانی فەرهەنگێکی فریزیۆلۆژی کوردی ـ رووسییە و بێشك ئەمە کارێکی پێویست و شایانە[٦٠] .

له کۆتایی ئەم بەشەدا دەمەوێ سەرەنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم که دەستنوسی ئەو فەرهەنگە کوردی ـ رووسییەی ئاکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی له ساڵانی بیستا نوسیویتی ئێستا له لایەن کارگێڕانی بەشی کوردی لێنینگرادەوە ئامادە کراوە بۆ چاپ . بەو وتارەدا که ئی. ئی. تسوکەرمان و ژ. س. موسیلیان له بارەی

---

(٥٩) И.И. Цукерман. Очерк курдской грамматики, Москва, 1962, стр. 35

( ئی. ئی. تسوکەرمان ، رێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۲ ) .

(٦٠) نوسەری ئەم وتارە دەستنوسی ئەو دوو فەرهەنگە ـ واته ئەوەی له لێنینگراد به سەرۆکایەتی قەناتی کوردۆ نوسراوە و ئەوەی له یەریڤان مەکسیمی خەمۆ خەریکێتی ـ بینیوە .

ئەم فەرهەنگەوە نوسیویانە وا دەردەکەوی کە کارێکی بایەخدار و نایاب و گرنگە[٦١] .

له ئەوروپا :

ساڵی ١٩٢٠ ئاغا بطرس ئەلۆ لە ژێر ناوی « رێزمان و فەرهەنگی ئاسوری و کوردی و یەزیدی »دا کتێبێکی بڵاوکردەوە[٦٢] ، نزیکەی ( ٩٠ ) لاپەڕەیەك دەبێت . بەشێکی کەی ئەم نوسراوە دەربارەی رێزمانەو ئەوی کەشی فەرهەنگە .

له پاش دەرچونی کتێبەکەی ر. ف. جاردین کە دەربارەی رێزمانی کوردی نوسیویتی و لە ساڵی ١٩٢٢دا لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە[٦٣] و فەرهەنگۆکێکی کوردی - ئینگلیزی بشی

---

(٦١) И.И. Цукерман, Ж.С. Мусаэлян. Курдско-русский словарь акад. И.А. Орбели, "Тезисы докладов П-й годичной научной сессии ЛО ИНА", март 1966, стр. 69-70

ئی. ئی. تسوکەرمان و ژ. س. موسیلیان ، فەرهەنگی کوردی ـ روسی ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی ، « کورتەی وتارەکانی ئامۆزگای رۆژهەلاتناسی لینینگراد » ، مارت ١٩٦٦ ، ل ٦٩ ـ ٧٠ .

(٦٢) Agha Petros Ellow. Assyrian, Kurdish & Yizidis, Indexed Grammar and Vocabulary, with a few Grammatical Notes. Baghdad, Government Press, 1920.

(٦٣) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji, a Grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mosul division and surrounding districts of Kurdistan. Baghdad, 1922.

تیایه، (ل ٥٥ ـ ١١٤)، له کوردناسی ئەوروپادا بۆ ماوەیەك هەست بە سستی و بێ بەرهەمی دەکرێت، بە تایبەتی له مەیدانی فەرهەنگ نووسیدا و تا ئەم ساڵانەی دوایی لەم بارەیەوە هیچ شتێکی وەها بڵاو نەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت. ئەوەی کە لەم ماوەیەی دواییشدا هاتبێتە کایەوە ئەمانەن:

ساڵی ١٩٦٥ جویس بلو فەرهەنگێکی کوردی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی لە پاریس بڵاوکردەوە[٦٤]. لەم فەرهەنگەدا هەندێ کەم و کورتی بەرچاو دەکەوێ، وەك ئەوەی گەلێك وشەی پێویست و ئاشکرا نەکەوتوونەتە ناوەوە و هەروەها هیچ رستە و نموونەیەك بۆ روونکردنەوەی مانا و بەکار هێنانی وشە نەهێنراوەتەوە .... لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فەرهەنگە کارێکی نایاب و بایەخدارە و کەڵك و سوودی زۆرە و لە مەیدانی کوردناسیدا ناسراوە.

ئەوەی شایانی باس و قەدر زانین بێت ئەوەیە لە ساڵی ١٩٦٦ دا زانای بە ناوبانگی کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی بە هاوکاری س. ئەدمۆنس فەرهەنگێکی کوردی ـ ئینگلیزی لە لەندەن بڵاوکردەوە[٦٥]. ئەم فەرهەنگە یەکێکە لە کارە مەزنەکانی کوردناسی بە گشتی و یەکێکە لە فەرهەنگە سەرکەوتووەکانی کوردی بە تایبەتی. لەم فەرهەنگەدا گەلێك کاری ئاڵۆز و نائاشکرا لە رێگایەکی زانستییەوە یەکالا

(٦٤) Joyce Blau, Dictionnaire Kurde - Francais - Anglais, Paris, 1965,

(٦٥) Taufiq Wahby and C. J. Edmonds. A Kurdish - English dictionary, London, 1966.

کراوەتەوە . بەرخق و نایابی ئەم کارە لە کوردناسـیدا دەنگێکی باشی داوەتەوە .

لەم فەرهەنگەدا بەشێکی زۆری وشەکان خراونەتە ناو رستەی کورت و ئاسانەوە ، بەمە مانای وشەکان باشـتر ئاشکرا بوون و بۆ خوێنەریش لەم رێگەیەوە رۆن بوەتەوە چۆن ئەو وشانە لە رستەدا بەکار بهێنێ . نوسـەرانی ئەم فەرهەنگە بەمە لەگەڵ ئەو رایەی فەرهەنگنوسـی ناسراوی رۆس ئەکادیمی (ل. ف. شـێربا)دا یەك دەگرنەوە کە دەڵێ : بەپێی وشەی زمانێك لەگەڵ زمانێکی تر تەنها ئەوە نییە کە بەرامبەر یەکن و هاوواتـان ، بەڵـکو پەیوەندی ئاڵۆز و جیاوازیش لە شێوەی بەکار هێنانیاندا هەیە[٦٦] .

جگە لە چەند کەم و کورتییەکی زۆر کەم کە لەم فەرهەنگەدا دەبینرێ ، ئەوەی لەگەڵ رای من نەگونجێ ئەوەیە کە لە رێکخستنی فەرهەنگەکەدا تەنیا رەگی وشەکان نوسـراوە و ئێنجا ئەو وشانەی لێیانەوە دروسـت دەبن لە دوایانەوە هاتون . بە بیری من پەیڕەوی کردنی ئەم ڕێبازە کە هەندێك لە زانایانی رۆژئاواش لە سـەری رۆیشتون، هەرچەند کاری چاپ ئاسان دەکات ، بەڵام دۆزینەوەی وشە لە فەرهەنگی کوردیدا ئاسان ناکات . هەروەها لەبەر ئەوەی

---

(٦٦) Л.В. Щерба. Опыт общей теории лексикографии, "Известия ОЛЯ АН СССР", № 3, Москва, I940

( ل. ف. شێربا ) تیۆری فەرهەنگنوسی ، « هـەواڵەکانی ئـەدەب و زمان لە ئەکادیمیەی زانـی سۆڤێت » ، مۆسکۆ ، ١٩٤٠ ، ژ ٣ .

ئەمڕۆ لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی زانستی وشە ( lexicology ) لە زمانی کوردیدا زۆر کەمە ، دوور نییە هەندێ وشە بە هەڵە نەکەونە ژێر رەگی خۆیانەوە .

لە ئەمەریکاش پەرتکای جیهانی ( World publishing company ) لە سالی ١٩٦٥ دا فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ـ کوردی ( ٣٠ ) لاپەڕەیی بڵاوکردەوە[٦٧] . ئەم فەرهەنگوکە بۆ گەریدەکان دانراوە و شەش قەوانی لەگەڵدایە .

لە ساڵی ١٩٦٧ یشدا ئەرنست مەکارۆس فەرهەنگێکی کوردی ـ ئینگلیزی لە چاپ دا[٦٨] . بەداخەوە کەم و کورتی و ناتەواوی لەم فەرهەنگەدا ئێجگار زۆرە ، بە تایبەتی لە وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای وشە و لە ریزکردنی وشە کوردییەکان و لە ئیملادا ..... هتد .

● ● ● ●

تا ئێستا نزیکەی ( ٥٠ ) فەرهەنگ و فەرهەنگۆکی کوردی بڵاوکراوەتەوە[٦٩] ـ واتە گەنجینەیەکی بچوکمان هەیە . هەرچەندە

---

Kurdish, The world publishing company, Cleveland (٦٧) and New York, 1965.

Ernest N. McCarus. A Kurdish-English dictionary, (٦٨) dialect of Sulaimania, Iraq. Ann Arbor (Michigan), 1967.

(٦٩) شایانی باسە زوربەی ئەو فەرهەنگە کوردییانەی لەم وتارەدا ناویان براوە لە کتێبخانە رازاوەکەی «کۆڕی زانیاری کورد»دا هەن.

زوربەی ئەم فەرهەنگانە ، لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ، لە سەر شێوە و ڕێگایەکی زانستی دانەنراون ، لەگەڵ ئەوەشدا بە نیسبەت کاری فەرهەنگنوسی کوردییەوە چەند هەنگاوێکی گەورە نراوە و ژمارەیەك فەرهەنگی سەرکەوتومان هەیە .

بە نیسبەت فەرهەنگە کۆنەکانەوە بە بیری من دوانیان سەرکەوتون : ئەوانیش فەرهەنگی ئیتالیایی ـ کوردی (ماوریزۆ کارزۆنی) و کوردی ـ فەرەنسایی (ئا. ژابا) ن .

وەك ئاشکرایە ، ماوەیەکە کاری فەرهەنگنوسی کوردی خەریکە جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیری و زانستی گەلی کورددا دەگرێت و هەندێك مامۆستای دڵسۆز ، وەك : تۆفیق وەهبی ، قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، شێخ محەمەدی خاڵ ، گیو موکریانی ، مەردۆخ ، عەلائەددین سەجادی ، چەرکەزی بەکۆ (باکایێف) ، جەمال نەبەز ، ئیڤان فاریزۆڤ ، سەمەندی سیابەند ، جگەر خوێن ... هتد لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە . ئەم مامۆستایانە لە دەرگایەکی فراوانەوە چونەتە ناو مێژوی ڕۆشنبیری کوردەوە ، بەوەی هەر یەکەیان لە سنوری توانای خۆیدا ئەوەی لە باریدا بووە بۆ پاراستنی زمانی نەتەوەکەی دڵسۆزانە جێ بەجێی کردووە و گەلێك ڕۆژهەڵاتناسی بێگانە باسی نرخی فەرهەنەکانی مامۆستایان : تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ و شێخ محەمەدی خاڵ یان کردوە .

هەر چەندە لە کاری فەرهەنگنوسی کوردیدا هەندێ کێشەی

ئاڵوزی زانستی وشە Lexicology بەگشتی و زانستی فەرهەنگنوسی Lexicography بە تــایبەتی جارکراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێـك کێشەی تری زانستی وشــە و زانستی فەرهەنگنوسی لە زمــانی کوردیدا هێشتا بیر و توکی قەڵەمیان نەگەیشتوەتێ .

وەك ئاشکرایە ، کاری فەرهەنگنوسی بە دوو رێچـــکەدا تێدەپەڕێ : یەك ـ تیۆری ، دوو پراکتیك . یەکەمیــان رێژەوێکی تیۆری لەســـەر شێواز و لێکۆڵینەوەی زانستی دەهێنیتە بەرهەم ، دوەمیش ئەو ڕێژەوە تیۆرییە لە دانانی فەرهەنگدا تطبیق دەکات . لە نێوان ئەم دوو رێچکەیەدا پەیوەندی بـــە هێز هەیە توند پێکەوە بەستراون و هەنگاو و بە هەنگاو لەتەك یەك دەڕۆن . فەرهەنگ نوسێك تەنها بە پراکتیك و زانینی خۆی لە دانانی فەرهەنگدا سەر ناکەوێت . بۆ ئەم مەبەســـتە پێویستە ئاوڕ لە رێژەوی تیۆری بداتەوە . تیۆری رۆنیش ـ واتە بێ سود وەرگرتن لە پراکتیـك ئەنجامی بە کەڵـکی نابێت .

ئەوەی لـــەم بارەیەوە شایانی باســـە ، ئەوەیـــە لە دانانی هەندێ فەرهەنگی کوردیدا ســـود لە تیۆری فەرهەنگنـوسی وەرگیراوە ، بە تایبەتی لە فەرهەنگی مامۆستایان : توفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ ...... دا ، کە لە رێگای هەوڵ و کۆشش و زانین و تەجروبەی خۆیانەوە گەیشتونەتە ئەنجامی بەکەڵك . بەڵام بە داخەوە ، دەربارەی زانـسی فەرهەنگنوسی هیـچ شتێکی ئەوتۆ بە زمانی

کوردی نەنوسراوە و ئەمـــەش کۆسپێکی گـەورەیە لە ڕێگای فەرهەنگنوسە بەڕێزەکانماندا .

وەك ئاشکرایە، زمانی کوردی بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق وردە وردە بە بەرەو پێشەوە دەڕوات بەڵام پێویســـتە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەشدا تیۆری فەرهەنگنوسی هەنگاوی خۆی بهاوێژێ و بە هاوکاری پراکتیك و تیۆری فەرهەنگی نایاب و بەنرخ بێتەکایەوە .

• • • •

# فەرھەنگۆك *

| | | |
|---|---|---|
| ئاوەڵناو | الصفة | Adjective |
| - ئاوەڵناوی سادە | الصفة البسيطة | Adjective Simple |
| ئێتیمۆلۆژی | الاتيمولوجيا ( علم اصل الـكلمة و تاريخها ) | Etymology |

---

(*) لەم کتێبەدا ھەندێ زاراوی زمان ، بەتایبەتی ئەو زاراوانەی لە باسی زانستی وشـــەدا بەکار دەھێنرێن ، بەر چاو دەکەون ... لەبەر چەند ھۆیەکی ئاشکرا ، ئەو زاراوانەمان گردکردەوە و وەك فەرھەنگۆکێك لە پاشکوێ ئەم کتێبەدا بلاومان کردەوە .

بەش بە حاڵی زاراوی کوردی ، تا بڵێی بە رچە و رێگایەکی ناھەمواری پێشکەوتندا تێپەڕیوە و ھەمیشە لە کێشە و بەرەدا بوە . بەداخەوە تاکو ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا ھیچ نوسراوێکی وەھا نییە کە بە شێوەیەکی نیوری ڕێڕەوێك بێت بۆ چۆنێتی دانان و وەرگێڕان و داڕشتنی زاراو ، بەلام ئەگەر تەماشای مێژوی ئـەم کارە بکەین ، ئەوە پێشکەوتن و گەشەکردنی ئـەوەمان نیشان دەدن کە لە زیانی پرا کتیکدا شارەزابون و ھیوژی پەیدا کردن بونەتە ھۆی سەرکەوتنی .

تا ئەم ساڵانەی دواییش لە زمانی کوردیدا ، جگە لە زاراوی رەسەنی کوردی ، زاراوی عەرەبی و فارسـی و تورکـی زۆر بەکار دەھێنران . بەلام لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ژیانی سـیاسی و ئابوری و زانستی ...دا زاراو پەرەی ســەند و پێویستی بەوە کرد کە گرنگـی پێ بدرێ و لێی بکۆڵرێتـەوە و وشەی جوان و راست و=

| | | |
|---|---|---|
| Superlative Degree | اسم التفضيل (المرتبة العليا) | پلەی باڵا |
| Comparative Degree | اسم التفضيل | پلەی بەراورد |
| Letter | الحرف | پیت |
| Derivation | الاشتقاق | داڕشتن |
| Unit | وحدة | دانە |
| Sound | الصوت | دەنگ |
| Sentence | الجملة | رستە |
| Language | اللغة | زمان |

= گونجاو و لەبار و رەسەنی کوردی بدۆزرێتەوە و دابنرێ و دابڕێژرێ و داهێنرێ و داتاشرێ .

لە ئەنجامی پێشکەوتندا پێویستمان بە گەلێ زاراوی کوردی بوو . کاتێك کتێبەکانی فێرگەکان کران بە کوردی پێویستی وەرگێڕانی ئەو زاراوانە هاتە کایەوە . بەم جۆرە کاتێك خوێندن بوو بە کوردی گەلێك زاراوی زانستی دۆزرانەوە و زیندوو کرانەوە ، وە گەلێکی نوێ داڕێژران و داتاشران ... جگە لەوە ئەم کارە لە سنووری قوتابخانە نەپەڕی و فراوانتر بوو و ژمارەیەك مامۆستای دڵسۆز و هەندێ دەزگای کوردی و لیژنەی تایبەتی خۆیان بە دانانی فەرهەنگی زاراوەوە خەریك کرد . هەروەها لەو لێکۆڵینەوانەدا کە دەربارەی زمان و ئەدەب و فۆلکلۆر و مێژوو ... هتد بڵاوکراونەتەوە ، نووسەرەکانیان بە پێی پێویستی باسەکانیان زاراوی کوردییان دۆزیوەتەوە و داناوە و داڕشتوە ...

بێگومان ئێمەش لە نووسینی ئەم کتێبەدا پێویستمان بە هەندێ زاراو بوو . ئەوەی زۆر دانرابوو و بەلامانەوە لەبار و رەسەن بوو وەرمان گرت . ئەوەش کە نەبوو ، یاخود هەبوو بەڵام بە رای ئێمە جوان و =

| | | |
|---|---|---|
| ـ زمانناس | لغوي ، عالم اللغة | Linguist |
| ـ زمانه ئێرانییەکان | اللغات الايرانية | Iranian languages |
| ـ زمانه هیـــند و ئەوروپاییەکان | اللغات الهندو ـ أوربية | Indo - European languages |
| ـ زمانی نێو میلەتان | لغة عالمية | International language |
| سینتاکس | علم النحو | Syntax |
| فرێز | العبارة (المقدة) | Phrase |
| ـ فرێزی بەرەڵلا | العبارة الصريحة | Free phrase |

---

= گونجاو نەبێ ، ئەوە بە سەلیقەی خۆمان جێگـەیمان پڕ کردەوە .

لە بەجێ هێنانی ئەم کارەدا بە زۆری پەنامان بردۆتە بەر زمانی کوردیی و مایەی خۆشییە کە زمانەکمان دەوڵەمەندە و توانیومانە وشەی وەها بهێنینە کایەوە کە گەلێك لەبار و گونجاو بن و جێگـەی زاراوی بێگانە بە تەواوی بگرنەوە . بۆگۆمان ئەگـەر زاراوێك لە کوردیدا نەبێ و یاخود پڕ بە پێستی زاراوە عەرەبیەکە نەبێت ، ئەوسا یا هەر عەرەبیەکمان وەرگرتوە ، یاخود پەنامان بۆ لاتینیی بردوە و ئەمەش دیاردەیەکی واقعیە و لە گشت زمانێـکی سەر ئەم زەمینەدا رەچاو دەکرێ .

ئێمەش دەزانین هیچ کارێك ، ئەویش کارێـکی سەرەتایی و تازە بێ کەم و کورتی نابێ و دوور نییە لە هەڵبژاردن و داڕشتنی ئەم زاراوانەدا تووشی هەڵە بووبین . بۆیەکا تکا لە زانایان و رووناکبیرانی کورد دەکەین ، ئەگـەر زاراوی لەوانە جوانتر و رەســەنتر و لەبارتریان بۆ شك دێ یا بە بیر دێتەوە بیخەنە پێش چاو ، تا کەلك لە زانیاری ئەوان وەرگرین و جێی زاراوە ناڕاست و جێنەگرتووەکانمان پڕ بکەینەوە و لە ئەنجامدا کارەکە پوختەتر و بە قازانجتر بێت .

| | | |
|---|---|---|
| Linked phrase ( Phrascology, Idiomatic ) | الكناية ، العبارات الاصطلاحية | ـ فرێزی گیراو |
| Phraseology | علم الكناية ، علم العبارات الأصطلاحية | ـ فرێزبۆلۆژی |
| Phraseological collocation | الكناية للمقدة | ـ فرێزبۆلۆژی تێك ئالاو |
| Phraseological concretion | الكناية للتحمة | ـ فرێزیـۆلـۆژی تێکچرژاو |
| Phraseological unity | الكناية للوحدة | ـ فرێزیـۆلـۆژی یەکگرتو |
| Phonetics | علم الأصوات | فۆنەتیك |
| Vocabulary, Dictionary | قاموس ، معجم | فەرهەنـك |
| Lexicographer | مؤلف معاجم (قواميس) | ـ فەرهەنـك نوس |
| Lexicography | علم وضع القواميس ، علم تصنيف للماجم | ـ فەرهەنك نوسـی |
| Verb | الفعل | کار |
| Compound Verb | الفعل للركب | ـ کاری لێکدراو |
| Lexicology | علم للفردات القاموسية | لێـکسیـکۆلۆژی |
| Meaning | للعنى | مانا |
| Indirect .... | للعنى غيرللباشر | ـ مانای تیان |
| Direct ( proper ) meaning | للعنى الحقيقى | ـ مانای حەقیقی |

| | | |
|---|---|---|
| Direct . . . | المعنى المباشر | ـ ماناى راستەوخۆ |
| Transferred meaning | المعنى المجازي | ـ ماناى مەجازى |
| Morphology | علم الصرف | مۆرفۆلۆژى |
| Morpheme | المورفيم | مۆرفێم |
| Semasiology | علم معاني الالفاظ | واتاناسى |
| Word | الكلمة | وشە |
| Free word | الكلمة المطلقة | ـ وشەى بەرەڵلا |
| Autosematic word | الكلمة التامة | ـ وشەى تەواو |
| Antonym | الاضداد | ـ وشەى دژواتا |
| Calque. Translation loan - word | كلمة مقتبسة بالقياس | ـ وشەى زۆمۆێژ |
| Primary word | الكلمة البسيطة | ـ وشەى سادە |
| Polysematic | من جوامع الكلم ، الكلمة ذات المعاني الكثيرة | ـ وشەى فرەواتا |
| Liuked word | الكلمة المقيدة | ـ وشەى گیراو |
| Compound , composite word | الكلمة المركبة | ـ وشەى لێكدراو |
| Obsolete | الكلمة الميتة | ـ وشەى مردە |
| Syntactic word | الكلمة الناقصة | ـ وشەى ناتەواو |
| Neologism | الكلمة المولدة | ـ وشەى نوێباو |

| | | |
|---|---|---|
| ـ وشەی هاوبێژ | المشترك اللفظي | Homonym |
| ـ وشەی هاوواتا | المرادف | Synonym |
| ـ وشەی یەکواتا | الكلمة ذات المعنى الواحد | Monsemous word |



# سەرچاوە

## بە زمانی کوردی

١ ـ ئۆسکارمان ، تحفهء مظفریه ، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەوەسەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٢ ـ پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، زمانی کوردی « دەفتەری کوردەواری » ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ب ٣ ، ل ١٠٤ ـ ١١٠ .

٣ ـ د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە کوێوە دەست بکەین بە دەستوور سازی ڕێزمانی کوردی ، بەشی یەکەم ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ١٩٧٣ ، ل ١٨٠ ـ ٢١١ ؛ بەشی دووەم ، هەمان گۆڤار ، ب ٢ ، ١٩٧٤ ، ل ٢٢٤ ـ ٢٦٢ .

٤ ـ جەمال بابان ، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣م ، ل ٥٦٩ ـ ٦٢٣ .

٥ ـ جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ریاضیات لە ژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ٦ ، ل ١٠٢ ـ ١٠٩ ؛ ژ ٧ ، ل ١١٢ ـ ١٢١ ؛ ژ ٨ ، ل ٨٥ ـ ٩١ .

٦ ـ سعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .

٧ ـ طاهر صادق ، ڕێنووس . چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکوك ، ١٩٦٩ .

٨ ـ عەلائەددین سەججادی ، وشەی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٤٨ ـ ١٧٨ .

٩ ـ د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ و د. ئیحسان فوئاد و سادق بەهائەددین ، زمان و ئەدەبی کوردی ( بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ) ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٢ .

١٠- غەفور رەشید ، سەرنجێك لە بەراوی زاراوەكانی زانستی كوردی گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ١٢ ، ل ٢٧ - ٣٥
١١- د. كمال فوئاد ، زمانە ئیندۆ - ئەوروپیەكان ، گۆڤاری « پرشنگ » بەرلین ، ١٩٦٦ ، ژ ١ ، ل ٢٠ - ٢٤ .
١٢- محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی كوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .
١٣- نوری عەلی ئەمین ، قواعدی زمانی كوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ب ٢ .
١٤- نوری عەلی ئەمین ، رێزمانی كوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .
١٥- هەژار ، كورد و سەربەخۆیی زمان ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەكەم ، بەغـدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٨٠ - ٣٢٣ .

## بە زمانی عەرەبی

١٦- الدكتور ابراهيم أنيس ، من أسرار اللغة ، الطبعة الثالثة ، القاهرة ، ١٩٦٦ .
١٧- الدكتور ابراهيم السامرائي ، فقه اللغة المقارن ، بيروت ، ١٩٦٨ .
١٨- الدكتور ابراهيم السامرائي ، مباحث لغوية ، النجف ، ١٩٧١ .
١٩- توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، بيروت ، ١٩٥٦ .
٢٠- عباس حسن ، النحو الوافي ، الجزء الأول ، القاهرة ، ١٩٧١ .
٢١- ڤلاديمير مينۆرسكي ، الأكراد أحفاد الميديين ( ترجمة وتعليق د. كمال مظهر احمد ) ، « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الأول ، العدد الأول ، بغداد ، ١٩٧٣ ، ل ٥٥٢ - ٥٦٦ .
٢٢- الدكتور محمد احمد ابو الفرج ، المعاجم اللغوية ، بيروت ، ١٩٦٦ .

## بە زمانی رووسی

٢٣- یو. یو. ئاڤالیانی ، مەسەلەی جودا كردنەوەی كاری لێكدراو و فرێزیۆلۆژی كار ( لەسەر كەرەستەی زمانی كوردی ) - « كورتەی

هەواڵەکانی کۆنفرانسی زمانناسی » ، سەمەرقەند ، ۱۹۵۸ ، ل ٤٠-٤٣ .
٢٤- ئی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانییەکان ، ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٣ .
٢٥- س. ئی. ئۆژیکۆڤ ، لێکسیکۆلۆژی و فەرهەنگنوسی و کولتوری ئاخاوتن ، مۆسکۆ ، ۱۹٧٤ .
٢٦- ر. ئا. بوداگۆڤ ، مێژوی وشە لە مێژوی کۆمەڵدا ، مۆسکۆ ، ۱۹٧١ .
٢٧- م. ف. پالبفسکایا ، وشەی هاووانا لە زمانی روسیدا ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٤ .
٢٨- ئی. ئی. تسوکەرمان ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٢ .
٢٩- ئی. ئی. تسوکەرمان و ز. س موسیلیان ، فەرهەنگی کوردی - روسی ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی ، « کورتەی وتارەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لینینگراد » مارت ۱۹٦٦ ، ل ٦٩ - ٧٠ .
٣٠- ئا. ئا. ریفۆرماتسکی ، سەرەتایێك لە زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٧ .
٣١- ی. ئا. زیمسکایا ، وشە چۆن سازدەبێ ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٣ .
٣٢- س. ن. سۆکۆلۆڤ ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۱ .
٣٣- ن. م. شانسکی ، فرێزیۆلۆژی زمانی روسی ئەمڕۆ ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٣ .
٣٤- ن. ئا. شانسکی ، لێکسیکۆلۆژی زمانی روسی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ۱۹٧٢ .
٣٥- ل. ف. شێربا ، تیۆری فەرهەنگنوسی ، « هەواڵەکانی ئەدەب و زمان لە ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیێت » ، مۆسکۆ ، ۱۹٤٠ ، ژ ٣ .
٣٦- ل. ف. کالینین ، موفرەداتی زمانی روسی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٦ .
٣٧- ز. م. کالینینا ، لە بارەی لێکسیکۆلۆژی زمانی ئەدەبی پشتۆیی ئەمڕۆوە ، مۆسکۆ ، ۱۹٧٢ ،
٣٨- ف ف. لۆپاتین ، لە دایك بونی وشە ، مۆسکۆ ، ۱۹٧٣ .
٣٩- مەکسیمی خەمـو ( خامۆیان ) ، دەربارەی فرێزیۆلۆژی نـاو لە زمانی کوردیدا ، یەریڤان ، ۱۹٧١ .

## فەرهەنگ و فەرهەنگۆك

٤٠- ئو. س. ئاخانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦
( رووسی - ئینگلیزی - فەرەنسی - ئەڵمانی - ئیسپانی ) .
٤١- م. اورنگ ، فرهنگ کردی ، تهران ، ١٣٤٧ .
٤٢- ج. خ. باکاییف ، فەرهەنگی کوردی - رووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .
٤٣- بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ،
ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ؛ ژ ٧ - ٨ ، بەغدا ، ١٩٧٤ .
٤٤- پ. س. پالاس ، فەرهەنگی بەراوردی هەموو زمان و شێوەکان ،
پیترسبورگ ، ١٧٨٧ .
٤٥- جگەر خوێن ، فەرهەنگا کوردی ، ب ١ - ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ .
٤٦- جەمال نەبەز ، هەندێك زاراوەی زانستی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .
٤٧- جەمال نەبەز ، فەرهەنگۆکی زانستی ، هەولێر ، ١٩٦٠ - ١٩٦١ .
٤٨- خەبەرناما تێرمینۆلۆجیێ فەلەیی - کورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٥ .
٤٩- خەبەرناما ژ زمانێ فەلەیی - کورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٣ .
٥٠- زاراوەی پارێزگای سلێمانی ، ١٩٧١ .
٥١- سەمەندێ سیابەند ، ئارامێ چاچان ، خەبەرناما ئەرمەنی - کوردی ،
یەریڤان ، ١٩٥٧ .
٥٢- شاکر فتاح ، فەرهەنگۆك ، ئینگلیزی - کوردی و کوردی - ئینگلیزییە ،
رەواندوز ، ١٩٣٤ .
٥٣- شێخ مارفی نۆدێ ، احدی ، بەغدا ، ١٩٣٦ .
٥٤- شێخ مارفی نۆدێ ، احدی ، سلێمانی ، ١٩٣٦ .
٥٥- شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی « خاڵ » ، ب ١ - ٢ ، سلێمانی ،
١٩٦٠ - ١٩٦٤ .
٥٦- شێخ محەمەدی مەردۆخ ، فەرهەنگی « مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦ .
٥٧- صادق بەهائەددین ، ئیدیەمێت کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

٥٨- ئی. ئۆ. ڤاریزۆف ، فەرهەنگی رووسی - کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .
٥٩- کۆڕی زانیاری کورد ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، زاراوی کارگێڕی ، ل ٤١٩ - ٥٢٦ ؛ ب ٢ ، ژ ١ ، لیستەی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ ، ل ٨٩٤ - ٩٤١ ؛ ب ٢ ، ژ ٢ ، لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ ، ل ١٦٦ - ٢١٨ ؛ ب ٣ ، ژ ١ ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، ل ٤٩٧ - ٥٤٢ .
٦٠- کۆڕی زانیاری کورد ، زاراوی کارگێڕی ، ١٩٧٣ - ١٩٧٤ ؛ زاراوی هەمەچەشنە ، ١٩٧٤ ؛ لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، ١٩٧٥ .
٦١- ق. کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی - رووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .
٦٢- ق. کوردۆ و .... ، فەرهەنگی کوردی ( کرمانجی خواروو ) - رووسی ( دەستنووس ) .
٦٣- کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنگی زانیاری ، عەرەبی - کوردی ، ب ١ - ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٤ .
٦٤- گیو موکریانی - « رابەر » ، فەرهەنگێکی ئوتابخانەیی عارەبی و کوردییە ، هەولێر ، ١٩٥٠ .
٦٥- گیو موکریانی - « کۆڵەکەزێڕینە » ، کوردی - فارسی - عەرەبی - فەرەنسی - ئینگلیزی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ١٩٥٥ .
٦٦- گیو موکریانی - « کۆڵەکەزێڕینە » ، کوردی - فارسی - عەرەبی - فەرەنسی - ئینگلیزی ، چاپی دووەم ، هەولێر ، ١٩٦٦ .
٦٧- گیو موکریانی - « مەهاباد » ، فەرهەنگێکی ئوتابخانەیی کوردی و عەرەبییە ، هەولێر ١٩٦١ .
٦٨- ب. لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێران و خالدیەکانی سەرووی باو باپیرانیانەوە ، پیترسبورگ ، بەشی یەکەم ١٨٥٦ ، بەشی دووەم ١٨٥٧ ، بەشی سێیەم ١٨٥٨ .
٦٩- عەبدولقادر بەرزنجی ، فەرهەنگی زانیاری ، سلێمانی ، ١٩٧١ .
٧٠- عەبدوڵلا زێوەر ، فەرهەنگی عەرەبی - کوردی ، سلێمانی ، ١٩٤١ ( دەستنووس ) .

٧١ـ عەلائەددین سەججادی ، دەستوّر وە فەرهەنگی زمانی کوردیێ - عەرەبی -
فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ .
٧٢ـ عیزەددین مەلا مستەفا ، فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد ، بەغدا ، ١٩٥٥ .
٧٣ـ منیر البعلبکی ـ « المورد » قاموس انکلیزی ـ عربی ، بیروت ، ١٩٧٢ .
Musa Anter, Ferhanga Kurdi - Tirki, Istanbul, 1967. -٧٤
٧٥ـ مەلا عبدالکریمی مدرس - « دوّ زشته » ، فەرهەنگێکی عەرەبی و
کوردی‌یە بە هەڵبەست ، بەغدا ، ١٩٧٠ .
٧٦ـ مەعروف قەرەداغی ، فەرهەنگی کشت و کاڵ ، ب ١ ـ ٢ ، بەغدا ،
١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ .
٧٧ـ موحەمەد ئەمینی میسری سەییدیان ، خود آموز سه زبان ، کردی ـ فارسی
عەرەبی . ١٩٧٣ ؟
٧٨ـ مەکسیم خەمۆ ، فەرهەنگی فزیۆلۆژی کوردی ـ روسی ( دەستوّس ) .
٧٩ـ نەجمەدین مەلا ، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان ، گۆڤاری « رۆژی
نوێ » ، ژ ١٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢١ ـ ٢٥ .
٨٠ـ ف. نیکیتین ، فەرهەنگی جەنگی روسی ـ کوردی ، ورمێ ١٩١٦ .
٨١ـ یوسف ضیاء الدین پاشا الخالدی للقدسی ، الهدیه الحمیدیة فی اللغة الکردیة ،
استانبول ، ١٣١٠ ﻫ ـ ١٨٩٣ م .
٨٢ـ س. ئا. یەگیزاروّف ، مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی پارێزگای
یەریڤان ، « هەواڵەکانی لقی قەفقاسیای کۆمەڵی جوگرافی روسی
ئیمپراتۆري » ، تفلیس ، ١٨٩١ .
Agha Petros Ellow. Assyrian, Kurdish & Yizidis, -٨٣
Indexed Grammar and Vocabulary, with a few
Grammatical Notes. Baghdad, Government Press, 1920
Ernest N. McCarus. A Kurdish - English dictionary, -٨٤

dialect of Sulaimania, Iraq. Ann Arbor (Michigan), 1967.

L. O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minnea- ٨٥-
polis, 1919.

A. Jaba, Dictionnaire Kurde - Francais, St-Petersbourg, ٨٦-
1879.

R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji; a Grammar of the ٨٧-
Kurmanji of the Kurds of Mosul division and Surr–ounding districts of Kurdistan. Baghdad, 1922.

joyce Blau, Dictionnaire Kurde - Francais - Anglais, ٨٨-
Paris, 1965.

Kurdish, The world publishing company, Cleveland ٨٩-
and New York, 1965.

Le Coq, Kurdische Texte, Berlin, 1903; T. I.II. ٩٠-

Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della ٩١-
lingua kurda, Roma, 1787.

E. Prym and A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt ٩٢-
I.II, S. Pbg, 1887 - 1890.

C. J. Rich, Narrative of a residence in Koordistan ٩٣-
and on the site of ancient Niniveh,...... London, 1836-1837. pp. 394-398.

S. A. Rhea, Brief Grammar and vocabulary of the ٩٤-
Kurdish Language of the Hakari district in « Journal of the American Oriental Society », New Haven, 1872 Vol. X.

E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, -١٥
1919.

E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish -١٦
Language, London, 1913.

Taufiq Wahby and C. J. Edmonds A Kurdish - English -١٧
dictionary, London, 1966.



# پێداچوونەوە

خوێنەرانی بەڕێز !
تکایە بەر لە خوێندنەوە ئەم چەند هەڵەیە ڕاست بکەنەوە .

ل ٣ ، دێڕ ٨ ـ وشەی ( شوێنیان ) بکرێت بە ( شوێنیانەوە )
ـ دێڕ ١٢ـ وشەی ( چەسپاندنیان ) بکرێت بە ( چەسپاندنیانەوە ) .
ل ٤ ، دێڕ ١ ـ بەرامبەر بە ( ئێتیمۆلۆژی ) نوسراوە : ( وشەداتاشین ـ الاشـتقاق ) . بەلاّم راستییەکەی : ( ئێتیمۆلۆژی ـ الاتیمولوجیا دراسە تعنی باصل الکلمات وتاریخها ) یە .
ـ پەراوێز ٢ ـ وشەی ( فرازیۆلۆژیَ ) بکرێت بە ( فرێزیۆلۆژیَ ) .
ل ٥ ، دێڕ ١ ـ ( بەلـکو ) بکرێتە ( بەڵـکو ) .
ل ١٣ ، دێڕ ٢ ـ وشەی ( تێکچوّن ) هەڵەیە و راستییەکەی ( تێکچوّن )ە .
ـ دێڕ ٣ ـ وشەی ( وەرگیراو ) هەڵەیە و راستییەکەی ( وەرگیراو )ە .
ل ١٤ ، دێڕ ٧ ـ وشەی ( مادەیەك ) لە جێی ( مادیك ) دابنرێت .
ل ١٨ ، دێڕ ٧ ـ وشەی ( ریبازی ) لە جێی ( رێبازی ) دابنرێت .
ل ٢٠ ، دێڕ ١٤ـ ( دیالێکتێك ) بخرێتە جێگەی ( دیالێکتیك ) .
ل ٢١ ، دێڕ ٢١ـ ( شیوّەی ) هەڵەیە و راستییەکەی ( شێوەی )ە .
ل ٢٩ ، پەراوێز ٣ ـ لە کۆتایی دێڕی دووەمدا نوسراوە ( لە ) ، بەلاّم راستییەکەی ( لەم )ە .
ل ٣٧ ، خانـە ٣ ـ وشەی ( ئەسپ ) هەڵەیە و بە فارسی دەبێتە ( ئەسب ) .
ل ٣٨ ، پەراوێز ١٣ـ وشەی ( motpheme ) بکرێت بە ( morpheme ) .
ل ٤٥ ، دوادێڕ ـ پاش وشەی ( دیاردە ) ، ( وَ ) نوسراوە کە زیادەیە .

# ناوەڕۆک

لاپەڕە

* * * *